# کانت

## نموونەیەك لە ژیان و کارە هزرییەکانی

نووسینی

**عیماد عەبەدولسەلام**

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

**پەژارە عەبدولحەمید**

پێداچوونەوەی

**شەهلا وەلی**

کوردستان ـ هەولێر

٢٠٠٥


**ناونیشانی کتێبی لێوەرگێڕدراو:**

د. عماد عبدالسلام رؤوف

کانت "ملامح عن حياته واعماله الفكرية"

اصدار: دائرة الشؤون الثقافية والنشر، بغداد

طبعة: ١٩٨٦

**ناوی کتێب:** (کانت)

- نووسینی: عیماد عەبەدولسەلام
- وەرگێڕانی: پەژارە عەبدولحەمید
- پێداچوونەوەی: شەهلا وەلی
- نەخشەسازی ناوەوە: طـــه حسین
- بەرگ: هۆگر صدیق
- سەرپەشتی چاپ: هێمن نەجات
- تیراژ: (١٠٠٠) دانە
- ژمارەی سپاردن: (٣٢٢)
- چاپی یەکەم: هەولێر ٢٠٠٥
- نرخ: (٧٥٠) دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب:



**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

**پۆستی ئەلکترۆنی:** asokareem@ maktoob.com

**ژمارەی تەلەفۆن:** 2260311

www.mukiryani.com




## ناوەڕۆک





## ڕێڕەوی ژیانی کانت

ئەمانۆئێل کانت لە ٢٢ی نیسانی ١٧٢٤ز لە شاری کۆنکسبێرگ، کە دەکەوێتە سەر سنووری باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیا، لەدایك و باوکێکی هەژار لەدایك بووە، باوکی دروستکەری چرا بووەو دایکیشی لە خێزانێکی سادە و ساکار پەروەردە بووە. هەندێ لە مێژوونووسان لەو باوەڕەدان، کە باوکی کانت لە خێزانێکی ئسکۆتلەندی بووە و نزیکەی سەدەیەك بەر لە لەدایکبوونی ئەمانوئێل، ئەم بنەماڵەیە کۆچیان کردووە بۆ پروسیا، بە ڕای ئەم مێژوونووسانە ئەم شتە هۆکارێکی سەرەکی بووە، بۆ ئەوەی هەر لە سەرەتاوە کانت مەیلێکی بەهێز دەربڕێت بەرامبەر بە فەیلەسوفە ئینگلیزەکان.

کانت لە خێزانێکی سادە و بەڕێزدا ژیانی بەسەربردووە، ئەگەرچی بە خۆشبەختی و ئاستی بەرزی بژێوی نەژیاوە، بەڵام تەنانەت ڕۆژێکیش هەستی برسیەتی و بێ بەشبوونی نەچەشتووە، ڕق و کینەی لەلا دروست نەبووە بەرامبەر بە چینی بۆرجوازی، بەڵکو لەسەر بنەمای ڕێزگرتن لە کارو ئەو فەزڵانەی، کە کار بە هۆیەوە سەرکەوتن بەدەستدێنێت، پەروەردە بووە، هەر لە ڕاستگۆیی و ڕێزگرتن لە ناموس و تا دەگاتە ئەمانەت و دڵسۆزی.



کانت بەوە ناوبانگی دەرکردبوو، کە زۆر دایکی خۆشدەویست، مەبەستیشی لەم شتە ئەو وتەیە نەبوو، کە لە بەرامبەر قوتابی و هاوڕێکەی (یاخمان) وتبووی -کە بەڕێوەبەری پەیمانگای پەروەردە بوو لە کۆنکسبێرگ-، کە دەڵێت: (من تا ماوم لە ژیاندا هەرگیز لەبیری ناکەم، کە یەکەم تۆوی خێرو چاکەی لە دڵمدا چاند). لە ڕاستیشدا لە ناو خێزانەکەیدا تەنها بنەماکانی ئەخلاق و ئایین فێرنەبووە، بەڵکو چاوی بە خۆشویستنی سروشت و مەعریفەوە هەڵهێناوە، چونکە زۆر جار دایکی کە ناوی (ئانا ڕۆجینا ڕۆتەر) بوو لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ گەڕان بە ناو شاردا بۆ ئەوەی چاوی بە جوانی سروشت و ئەو سیستمەی ئاسمان و زەوی شادبێت، هەروەها هەوڵی لێکدانەوەی دیاردەکانی دەدات بۆ کانت، بە گوێرەی ئەو مەعریفە و زانستانەی کە وەریگرتوو بوو.

دایکی کانت سووربوو لەسەر ئەوەی کوڕەکەی بە کولتوورێکی ئایینی دەوڵەمەند بکات، ئەو خۆی لەسەر ڕێبازی (تەقوا) بوو، کە ئەوساکە لە چەند بەشێکی ئەڵمانیا باوبوو، کانت لە تەمەنی هەشت ساڵیدا دەستی بە خوێندن کردووە، کە لە قوتابخانەی سەرەتایی پاشکۆی نەخۆشخانەی (قەدیس جۆرج) لە ساڵی ١٧٣٠ز نراوەتە بەر خوێندن و بووە بە قوتابیی مامۆستا و هاوڕێی بنەماڵەکەی، کە ناوی (شۆڵتز) بوو، دواتر لە هاوینی ساڵی ١٧٣٢ گوێزراوەتەوە بۆ کۆلیژی (شافردریك) لەوێشدا فێری ئەدەب و کلتووری لاتینی بووە، هەروەها





ئەو حەز و ئارەزووەی کە سەبارەت بە زانینی زانست و هونەری زانا کۆنەکان هەیبوو هاتەدی. بەڵام لە سیستمی ئەم قوتابخانەیەدا ئەو شتەی دەست نەکەوت کە هزرە کراوەکەی و شێوازی بیرکردنەوە ئازادەکەی رازی بکات، بەڵکو شێوازێك لە شەرم و وێنەیەك لە شکۆمەندی ئاینی بەرچاوکەوت. رۆژانی قوتابخانە بە نوێژێکی دوورودرێژی کڵێسە دەستیپێدەکرد و هەر بەوەش کۆتایی دەهات، ئەمەو جگە لە چەند نوێژێکی کورتی نێوان وانەکان، هەروەها هەفتانە دووکاتژمێر بەندایەتیان (عبادة) جێبەجێ دەکرد.

کانت لەو رێوڕەسمانەدا زۆر شتی بینی، کە وایلێکرد رق و کینەی لە لا دروستبێت و لە ئایین دوورکەوێتەوە، بەم شێوەیەش هیچ شتێك نەبوو کە هانیبدات بەرەو ئایین هەنگاو بنێت و دەستی پێوە بگرێت.

ئەوەندەی پێنەچوو کانت پەیوەندی بە کۆلیژی فەلسەفە- پاشکۆی زانکۆی (کۆنکسبێرگ)ەوە کرد، لەوێشدا خوێندنی لەسەردەستی (کفۆتسن) تەواوکرد "کفۆتسن؛ یەکێکە لە شوێنکەوتوانی فەیلەسووفی ئەڵمانی بەناوبانگ (وۆلف)ە". بەم جۆرە (کانت) توانی پەی بە رێبازی (لیبتز) بەرێت. کانت لەم ماوەیەدا بەهرەمەندییەکی تایبەتی لە خوێندنی لاتینی پیشاندا و وایلێهات، کە لە دواتر بتوانی بە وردی گوزارشت لە هەموو ئەو بیروبۆچونە ئالۆزانەی بکات، کە لە ئەنجامی پرۆسەی تاوتوێکردنی ژمارەیەك بیردۆزی زانستی یا لاهوتی تا دەگاتە بیردۆزە میتافیزیکییەکانیش (سەرو سروشتییەکان) دروست بووبوون.



وەك دەردەکەوێت کانت لە ساڵی ١٧٤٧ز ناچاربوو زانکۆ بەجێبهێڵێت و بە دوای پەیداکردنی بژێوی ژیانیدا بگەڕێت، ئەمەش لەبەر مردنی باوکی لە هەمان ساڵدا. کانت بووە بە مامۆستا و پەروەردەکەری تایبەتی بۆ رۆڵەکانی هەندێ لە بنەماڵە دەوڵەمەندەکان، کە لە رۆژهەڵاتی پڕوسیا دەژیان.

لە ساڵی ١٧٥٤ گەڕایەوە بۆ نیشتمانی خۆی (کۆنکسبێرگ)، کە بارودۆخ لەبارو گونجاو بوو؛ نامە لاتینەکەی بە ناوی (لە ناو ئاگر- في النار) پێشکەش بە زانکۆ کرد بۆ بەدەستهێنانی پلەی دکتۆرا لە فەلسەفەی سروشت. بەر لەم کارە کانت هیچ کارێکی تری فەلسەفی ئاماژە پێنەکرابوو، تەنها توێژینەوەیەکی بچووك نەبێت لە ژێر ناوی "بیروڕا سەبارەت بە پێوانەی راست بۆ هێزی زیندوو" کە تێیدا کاریگەربوونی بە تیۆری (کێشکردن-جاذبیة)ی نیوتن پیشاندەدات.

کانت لە پایزی ساڵی ١٧٥٥ز بووە بە وانەبێژی بیرکاری و سروشت و فەلسەفەو کاری وانەبێژی دەرەکیشی کردووە لە زانکۆکانی دەرەوەی وڵات. بە هۆی شارەزایی و توێژینەوەی بۆ بابەتی (جوگرافیای سروشتی)یەوە توانی توێژینەوەیەکی گرنگ لە هەمان ساڵدا لە ژێر ناوی (مێژووی سروشتی گشتی و تیۆری ئاسمان) بڵاوبکاتەوە واتە "لێکۆڵینەوە لە سیستم و رەگوڕیشەی میکانیکی گەردوون بە گوێرەی پرەنسیپەکانی نیوتن".





کانت تا ئەم قۆناغەش گرنگی بە گرفتە زانستییەکان دەدا، لە بۆچوونەکانیدا کاریگەر بوو بە ڕێبازی ئەقلانی (وۆڵف)، هەروەها لەم قۆناغەدا هێشتا پرەنسیپەکانی فەلسەفە رەخنەئامێزە بەناوبانگەکەی پێك نەهێنابوو.

لە ساڵی ١٧٦٦ (کانت) خۆی بۆ توێژینەوەی (کانزاناسی) (علم المعادن) ئامادەکرد، ئەمەش لە ڕێگەی دامەزراندنی وەك بەڕێوەبەری کتێبخانەی شار، کە ئەوەندەی پێنەچوو، زانکۆی (ئەرلنکن) داواکارییەکی پێشکەش کرد کە ببێت بە مامۆستای فەلسەفەی تیۆری و زانکۆی (پینا)ش هەمان کاری لێداواکرد، بەڵام کانت هیچ یەکێ لەم کارانەی قبووڵ نەکرد.

بەم شێوەیە ناوبانگی کانت لە هەموو کونجێکی ئەڵمانیا بڵاوبووەوە، تا وایلێهات ببوو بە تروسکەی ئومێدی هەندێ لە پیاوانی دەوڵەت، کە ئامانجیان چاککسازی کردن بوو لە سیاسەت و سستمی فێرکردنی وڵاتەکەیان. وەزیری فێرکردن (کارڵ زدلیتز) هەوڵێدا (کانت) رازی بکات بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی ئەو چاکسازانە لە ئەستۆ بگرێت ئەویش لە ڕێگەی وانە وتنەوەی لە زانکۆی (هالە)، بەڵام ئەم کارەشی رەتکردەوە و مانەوەی لە شار بە گرنگتر زانی.

لە ساڵی ١٧٧٠ شافردریکی دووەم رازی بوو (کانت) وەك مامۆستای لۆژیك و میتافیزیقا لە زانکۆی کونکسبێرگ دابمەزرێت، بەمەش گرنگترین قۆناغ لە پەرەسەندنی هزری (کانت) دەستپێکرد، کاتێك



کانت توانی رزگاری بێت لە کاریگەربوونی بە ئەقڵیەتی (وۆڵف)، هەروەها توانیشی هاوسەنگییەك دروستبکات لە نێوان ئەم ڕێبازی گومانگەرایی (ارتیابیة)ی هیۆم.

لە دواییشدا فەلسەفەیەکی قووڵ و نوێی هێنایە کایەوە و ناوی نا (فەلسەفەی رەخنەگەرایی). دەتوانرێت بوترێت، کە موژدەی ئەم فەلسەفەیە لەو کاتەوە دەستیپێکرد، کاتێك (کانت) نامە لاتینییە نەریتگەرایییەکەی، لە ساڵی ١٧٧٠ بۆ بەدەستهێنانی پایەی مامۆستای لۆژیك و میتافیزیقیا پێشکەش بە زانکۆ کرد و نامەکەشی بە ناوی (شێواز و پرەنسیپەکانی جیهانی هەستپێکراو و جیهانی ئەقڵ بڕکراو- معقول-) بوو. لەم نامەیەدا بیروڕاکانی لە بنچینەوە لەو بیروڕایانە دەچێت، کە لە کتێبی (رەخنەی ئەقڵی ئەبستراکت)دا دوای (١١) ساڵ بڵاوی کردووەتەوە. ئەو ماوە مێژووییەی نێوان نووسینی ئەم دوو کتێبە ماوەیەك بوو پڕ لە تێڕامان و توێژینەوەی قووڵ، کە تێیدا کانت دوو وتاری بچووکی بڵاوکردەوە؛ یەکەمیان بە ناوی (جیاوازییەکانی نێوان بنەماڵەکان- سەرجەلەکان-) دووەمیشیان بە ناوی (دەربارەی پەیمانگای فێرخوازی دوسۆ) وانەکانی (کانت) لە بارەی (میتافیزیقا)وە بەوە دەناسرانەوە کە روون و ئاشکرا بوون و بیروڕاکانی سەبارەت بەم بابەتە بە پێزتر دەکرد. دەرسگوتارەکانی بە پێناسەی بیروبۆچوونە میتافیزیقییەکان دەستپێدەکرد و ئینجا بە شێوەیەکی میتۆدی ورد باباتەکەی باسدەکرد (تاوتوێی دەکرد)، هەرچی





دەرسگوتارەکانیەتی سەبارەت بە (لاهوتی) و مەسەلە ئایینییەکان ئەوا بە ئامانجی رووناك کردنەوەی ئەقڵەکان ورووژاندنی (نەست) بووە و بێ ئەوەی هیچ گرنگییەکی تایبەتی بە سرووتە نەریتییەکان بدات. کەچی دەرسگوتارەکانی سەبارەت بە میتافیزیقا گرنگی پێدرابوو، تا وای لێهاتبوو جارجارە بیری لەوە دەکردەوە کە دەرسگوتار سەبارەت بە لاهوتی نەڵێتەوە.

کانت پەیمانی لە خۆی وەرگرتبوو بۆ ئەوەی بە دوای راستیدا بگەڕێت، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی دوورەپەرێز نەدەگرت لە خەڵك و کۆمەڵگا؛ راستییەکەی ئەم ژنی نەهێنابوو، کەچی دەبووایە لەگەڵ خەڵکیدا بژیت و، دەبوایە سەردانی هاوڕێکانی بکردایەوە ئەوانیش سەردانیان بکردایە.

بەڵام ئەوەی دەربارەی رقی (کانت) وتراوە بەرامبەر براکەی، ئەوا زیادەڕەوی کراوە سەبارەت بەم مەسەلەیە، راستییەکەی ئەوەیە، کە کانت زۆر سەرقاڵی توێژنەوەکانی بووە و، لە بەرامبەریشدا ئەوەی برایەتی پێویستی دەکرد (کانت) لە بەرامبەر براکەی ئەنجامیداوە، سەرەڕای ئەوەش لە دوای مردنی هاوسەری خوشکەکەی، خوشکەکەی بەخێوکردووە، دواتریش لە دوای مردنی خوشکەکەی منداڵەکانی ئەویشی بەخێوکردووە. ئەمەش هەڵسوکەوتی کانت بوو لەگەڵ کەسوکارەکەی.



لە ساڵی ١٨٠٣دا کتێبی خۆی بڵاوکردەوە سەبارەت بە (پەروەردە)، کە ئەو کات تەمەنی (٧٩) ساڵی بوو، باری ئەقڵی و تەندروستی کانت بەرەو رووخان دەچوو، چاوی بە تەواوی لە دەستدا و هیچ دوور نەبوو هزریشی لە دەستبدات، تا لە تەمەنی (٨٠) ساڵیدا لە ١٢ی شوباتی ساڵی ١٨٠٤ کۆچی دوایی کردو، دوا وتەشی ئەوەبوو کە وتی (ئەمە باشە) بوو.

ماڵئاوایی (کانت) لە ژیان شتێکی سەخن و جەماوەری بوو، کە زۆرینەی خەڵك تێیدا بەشداربوون، بۆیە لە ژێر کۆمەڵگاکانی دەرەوە (کاتدرائی)ی کۆنکسبێرگ نێژرا و لەسەر کێڵی گۆڕەکەی رستەیەك نووسراوە کە لە کتێبی (رەخنەی ئەقڵی زانستی)دا نووسیویەتی و بریتییە لە (دوو شتی سەیر و سەمەرە سەرسامم دەکەن؛ ئاسمانێکی رازاوە بە ئەستێرە لە بان سەرم و یاسایەکی ئەخلاقیش لە خودمدا).





## بۆچوونەکانی سەبارەت بە میتافیزیقا

کانت گرنگییەکی سەرسوڕهێنەری بە زیاتر لە لایەنێك لە لایەنەکانی میتافیزیقا دەدا. زۆر هەوڵی دەدا ئەم شتانە لەسە بنچینەیەکی لۆژیکی زانستی باوەڕپێکراو هەڵبسەنگێنێت. سەرەڕای ئەوەی باوەڕی هەبوو کە تەنها خودی (سەر و سروشتی) خۆی لە خۆیدا مانای ئەوەیە، کە مەحاڵە ملکەچی پێوەرە سروشتییە باوە زانستییەکانی وەك (فیزیا و بیرکاری) بکرێت. ئەمە کە هەندێك لە توێژەران بانگهێشتی بۆ دەکەن، کەوا کانت؛ کانتسیزم نەبووە، واتە فەلسەفەکەی بەرەو ئەو شتەی کێش دەکات، کە پێشتر خۆی رەتیکردبووەوە کە دانی پێدا بنێت.

ئامانجی کانت لە کتێبەکانی سەبارەت بەم جۆرە فەلسەفەیە، لە سەروشیانەوە (رەخنەی ئەقڵی ئەبستراکت) داڕشتنی فەلسەفەیەکی میتافیزیقی بوو لەسەر بنچینەیەکی زانستی قبوولکراو. بۆیە ویستی رێگا خۆش بکات بۆ داڕشتنی میتافیزیقایەك لە داهاتوودا، کە خالی بێت لە هەڵەو کەموکوڕییەکانی رابردوو. کانت لەم کتێبەیدا نەیدەویست هزرێکی میتافیزیقی پۆزەتیڤ بخاتەڕوو، بەڵکو دەیویست بیکات بە ئامرازێك بۆ ئەوەی یارمەتیدەری دۆزینەوەی رێگایەکی راست و دروست بێت بۆ توێژینەوەیەکی میتافیزیقای بەرهەمهێن. جا ئەم بیروڕایانەی لە ژمارەیەك نامە و






وتار و کتێبدا بڵاوکردووەتەوە لەوانەش؛ (دەربارەی هەر هەوڵێکی فەلسەفی لە بارەی پەروەردگارییەوە) ساڵی ١٧٩١، (پێشەکییەك بۆ هەر میتافیزیقیایەکی داهاتوو کە دەکرێت ببێ بە زانست) (لە ساڵی ١٧٨٣)، لێکدانەوەی خەونە- بە چاو یان ئەقڵ- بینراوەکان لە ژێر رۆشنایی خەونە میتافیزیقییەکانەوە) ساڵی ١٧٦٦ و (هەوڵدانێك لە پێناو تێکەڵکردنی چەمکی چەندایەتییە سالبەکان بە فەلسەفە) ساڵی ١٧٦٤.

کانت دەستی بەم کارانەی کرد بە پەیمانێکی تا هەتایی، کە لەگەڵ خودی خۆیدا بەستبووی، ئەویش بریتی بوو لەوەی واز لە بابەتە میتافیزیقییەکان (ئەو بابەتانەی لای ئەو بریتین لە خودا، سەربەخۆیی، نەمری) بێنێت، تاوەکو لە لێکدانەوەی داڕشتنی (زانستی بیرکاری و زانستی سروشت) دەبێتەوە، دواتر بگەڕێتەوە سەر توێژینەوەی میتافیزیقا و لەسەر هەمان ئەو بنەمایانەی ئەم دوو زانستە- میتافیزیقا- هەڵبسەنگێنێت. بەڵام کاتێك لە رەخنەگرتنی بۆ بیرکاری و زانستی سروشت تەواو بوو، پەیمانەکەی سەبارەت بە بونیادنانی میتافیزیقایەك لەسەر هەمان بنەماکانی ئەم دوو زانستە بەجێ نەگەیاند، بە بیانووی ئەوەی خودی رەخنە؛ ئەو میتافیزیقایەیە کە ئەو دەیەویست؛ بە واتایەکی تر ئەو گەیشتە ئەو ئەنجامەی، کە لێکدانەوەی بوارە زانستییەکان سەبارەت بە بیرکاری و سروشت، ئەو شتەیە کە هەر فەیلەسووفێك ئارەزووی دەکات بۆ

خۆی و شتێكی تر نییه، ئەگەر بۆ میتافیزیقا مانایەك هەبێت ئەوا لێكدانەوەی بوارە زانستییەكانە.

كانت هەمیشە هەوڵیدەدا وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە كە دەڵێت "چۆن دەتوانرێت میتافیزیقا بە زانست وەسف بكرێت؟" وەڵامەكەشی لە بەشێكی كتێبە گرنگەكەیدا هاتووە بە ناوی "پێشەكییەك بۆ هەموو میتافیزیقایەكی داهاتوو، كە لەوانەیە ببێت بە زانست" كورتەكەشی ئەوەیە كە (میتافیزیقا وەك ئامادەباشییەكی سروشتی بۆ ئەقڵ؛ واقعی دەبێت) ئەمەش مانای وایە، كە دەتوانرێت؛ ئەگەر ویسترا بە هۆیەوە بوارە زانستییەكان لێكبدرێتەوە بە جۆرێك رەهەندەكانی دیاریبكرێت و ئەو گریمانانەی ئەم بوارانە پشتی پێدەبەستن بخرێنەڕوو، بەڵام گەر تەنها لە خودی میتافیزیقاوە تەماشای كرا ئەوا دەبێتە شتێكی دیالێكتیك و پەردەپۆشی كراو. بەم جۆرەش (كانت) میتافیزیقای كرد بە شتێكی مەحاڵ و ئەستەم لەسەر ئەقڵییەتێكی تیۆری و خاوەن تێڕامان، ئەمە ئەگەر ویسترا بە هۆیەوە توێژینەوە لەسەر ئەو شتانە بكرێت، كە لە سەرووی ئەزموونی مرۆڤایەتییەوەن.

هەرچەندە مرۆڤ لە بیروڕاكانی (كانت) نزیك ببێتەوە، دەرك بەوە دەكات، كە بە چەند قۆناغێك دەگاتە ئەو ئەنجامەی، كە میتافیزیقا تەنها لێكدانەوەی بۆ بوارە زانستییەكانە. واتە مانایەكی نەرێنی (سلبی) پێدەبەخشێت و لە چالاكییە پۆزەتیڤەكانی پێشووی



دایدەماڵێنێت و، حاشا لەوەش دەكات، كە توێژینەوە تیایدا خۆی لە خۆیدا لەوانەیە ببێتە هۆی دروستبوونی شتێكی نوێی خاوەن ئامانج. بەڵێ ئەو پێی وایە قسەكردن لەسەر بابەتە میتافیزیقییەكان، كە بە رای ئەو بریتین لە خودا، سەربەخۆیی و نەمری، كارێكی ئاساییە، بەڵام ئەو كات ئەو كارە ئاسایی دەبێت گەر مەبەست لە توێژینەوەكە پێویستییەكی سروشتی بێت، چونكە ئەقڵی تیۆری ناتوانێت سنوورەكانی ببەزێنێت، بێ ئەوەی دەروونی بەرەو لەناوچوون نەبابێت و نوقمی تاریكی و نەگونجاندن نەبێتەوە.

كانت بۆ ئەوەی بێدەسەڵاتی ئەم ئەقڵە تیۆرییە بسەلمێنێت لە توێژینەوە میتافیزیقییەكانیدا، ئەوا هەوڵیداوە ئەم ئەقڵە رزگار بكات و رەخنە لەو زانیارییانە بگرێت كە كۆی كردوونەتەوە. بەم جۆرە فەلسەفە رەخنەئامێزە بەناوبانگەكەی پێشكەشكرد. كاتێك كانت باس لە رەخنە دەكات مەبەستی رەخنەگرتن لە كتێب و رێبازەكان نییە، بەڵكو مەبەستی رەخنەگرتنە لە ئەقڵ بە شێوەیەكی گشتی و بەتایبەتی سەبارەت بەو زانیارییانەی، كە هەوڵدەدات بەبێ پشتبەستن بە تاقیكردنەوە بگات و بەدەستیان بهێنێت. بەم جۆرە بابەتی سەرەكی رەخنەی كانت بریتییە لە جیاكردنەوەی گرفتی توانینی هەڵكردنی (گونجانی) میتافیزیقا و مەحاڵبوونی هەڵكردنی (گونجانی)یەتی بە شێوەیەكی تەواو. لەگەڵ گرنگیدان بە دیاریكردنی رەگورپیشەی ئەم زانستە و سنوورەكانی لەسەر بنچینە ئەقڵانییە دیار و ئاشكراكان.





بێگومان ئەوەی وایکرد، کە کانت گرنگییەکی بێ سنوور بە میتافیزیقا بدات بریتیبوو لە سەرنجدانی بۆ فەیلەسووفە ئەنتۆلۆژی و ئامانجگەرا و دۆگماییەکان... سەبارەت بە بنەما میتافیزیقییەکان لەسەر بنەمای تێڕامانی رەها، کە شیاو نییە بۆ رەخنەی راستەقینە، هەروەها چۆن فەیلەسووفە ئەقڵگەرا جەختکەرەکان رێبازی ناواخنگەرایی (استنباط) بەکاردەهێنن بۆ داڕشتنی (زانستی بوون- علم الوجود) لە رووی بوونەوە، وەك ئەوەی کە ئەقڵ لە توانایدا هەبێت بە ئاسانی بگوێزرێتەوە لە (رەنگە- ممکن)ەوە بۆ (هەبوون- الموجود) یان لە (بیرۆکەی خوا)وە بۆ (بڕیاردان لەسەر بوونی خوا) بۆ نموونە وەك ئەوەی (وۆلف) ئەنجامیدا.



## بۆچوونەکانی سەبارەت بە ئایین

لە راستیدا جیاکردنەوەی بیروڕاکانی کانت سەبارەت بە سروشت و میتافیزیقا و ئەخلاق لە بیروڕاکانی سەبارەت بە ئایین و لاهوت کارێکی زەحمەتە، ئەوەش لەبەر قووڵی فەلسەفەکەی و گەڕانی بە دوای توێژینەوە سەبارەت بە جەوهەری شتە راستەقینەکان، بێ ئەوەی ئاوڕێك لە روخساری دەرەکی ئەم شتانە بداتەوە، کە لەوانەیە لەسەر شێوەی سیاسەت یان ئایین یان ئەخلاق دەربکەون.

بەڵێ ناتوانرێت حاشا لەو شتانە بکرێت، کە (کانت) بانگهێشتی بۆ کردوون، لەوانەش؛ کەمکردنەوە لە پلەوپایەی پیاوانی ئایینی و گرنگی نەدانی بە ئەنجامدانی فەرزەکانی بەندایەتی و چوون بۆ کڵێسە. کە ئەمانە هاوڕێکانی لێی ئاگاداربوون، بەڵام (کانت) لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی چەسپاندنی ئایینێکی خودایی- راست-ی داوە، کە پشت نەبەستێت بە بیروبۆچوونە تەقلیدییەکانی پیاوە ئایینییەکان یان بڕیارە (کۆنە) مێژووییەکانی کلێسە، بەڵکو پشت ببەستێت بە مەیلە ئەخلاقییە بەرزو شاراوەکانی ناخی مرۆڤ، کە وایلێدەکات- مرۆڤ- بێتە ریزی فریشتەکان.

کانت بەوپەڕی تواناوە یەکەم شت کە هەوڵی بۆ داوە چەسپاندنی بنەما لۆژیك و ئەقڵ بڕەکانە (معقولة)، کە بوونی خودا بە شێوەیەکی گومان





هەڵنەگر دەسەلمێنێت. کاتێکیش خۆی بینی؛ ئەو بنەمایانەی، کە فەیلەسووفەکانی پێش خۆی پشتیان پێبەستووە کاتێك رەخنەیان لێدەگیرێت لەناو دەچن، بۆیە سووربوو لەسەر ئەوەی بواری میتافیزیقای (رووت) جێبهێڵێت، کە بە سروشتی خۆی ئەقڵی مرۆیی بڕی ناکات، بۆیە هەوڵیدا لەسەر یاسای ئەقڵی راست و دروستی وەرگیراو لە ئەخلاق- میتافیزیقاکەی- بوونیاد بنێت.

یەکەم تۆژینەوەی کانت لەم بوارەدا؛ نامە گرنگەکەیەتی کە لە ساڵی ١٧٦٣ لە ژێر ناونیشانی "تاکە کۆڵەگە، کە لەوانەیە ببێتە بەڵگە لەسەر بوونی خودا" کە تێیدا هەوڵی رووخاندنی هەندێ لە بیروباوەڕەکانی (ۆولف)ی داوە کە لە بواری لاهووتی (ئامانجگەرایی و سروشتی) دایڕشتبوو، جا ئەم نامەیە وەکو راگەیاندنی رزگاربوونی کانت بوو لە فەلسەفەی ۆولف، ئەمە یەکەم قۆناغە لە پەرەسەندنی رۆحی (کانت)، کەچی داوتر کەوتە ژێر کاریگەریی فەیلەسووفی ئینگلیزی بەناوبانگ (دیڤد هیوم).

کانت چوارچێوەی بیروبۆچوونەکانی پەرەپێدا و لە چەند بەشێکی تایبەتی کتێبە بەناوبانگەکەی بە ناوی (رەخنەی ئەقڵی ئەبستراکت)، کە لە ساڵی ١٧٨١ بڵاوی کردووەتەوە، جەختی لەسەر ئەوە کردووەتەوە، کە مەحاڵە بەڵگەی ئۆنتۆلۆژی (میتافیزیقای رووت) بە راستی بسەلمێنرێت (واتە بوونی میتافیزیقایەکی رووت بسەلمێنرێت) لەسەر بوونی خودا بەوەی، کە (بوونی خودا) تەواو و کامڵە و ناتوانین



پێی بگەین، ئەمە هزرێکی رەهایە و ئەو واقیعە ناسەلمێنێت، کە دەڵێت ئەقڵ هەردەم لەسەر شێوە واقیعە بابەتییەکەی داوادەکرێت، هەروەها ئەو لە بەشەکانی داهاتووی کتێبەکەیدا ئەو سەلماندنانەی رەتکردووەتەوە، کە فەیلەسووفەکان لە سەری رێککەوتوون وەك سەلمێنراوە تێڕامانگەرایی و ئامانجگەرایی و ئیستشرافییەکان. بەم جۆرە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە؛ بێگومان بوونەوەری باڵا بە گوێرەی رێبازی تێڕامانێکی رەها بۆ ئەقل، تەنها وەك نموونەیەکی باڵا دەمێنێتەوە، بەڵام نموونەیەکی باڵای بێ کەموکوڕی و خەوش. مانایەکی گشتی بۆ تەواوی زانیاری مرۆیی جێبەجێ و تەواو دەکات، ئەگەرچی ناتوانرێت راستییێتی واقیعە بابەتییەکەی بسەلمێنرێت، بەڵام بەم شێوەیەش ناتوانرێت ئەمە رەت بکرێتەوە.

لە ساڵی ١٧٩٣ کانت کتێبە ترسناکەکەی بڵاوکردەوە لە ژێر ناونیشانی (ئایین لە سنووری ئەقڵی ئەبستراکت). کە بە راستی بوێرترین کتێبە، کە ئەم نووسیبێتی و بەهێزترینی هەموو نووسینە بڵاوکراوەکانیەتی، کە تێیدا زۆر بە روونی رەخنەی لە ئەقڵییەتی پیاوانی ئایینی گرتووە و، تێبینی ئەوەی کردووە کە سرووتە ئاڵۆزەکانیان و هەندێ لە هەڵسوکەوتەکانیان لەگەڵ یاسا ئەخلاقییەکان ناگونجێن و، روونیشی کردووەتەوە، کە دەبێ بنچینەی ئایین پشت بە ئەقڵێکی کردەیی بۆ هەستی ئەخلاقی ببەستێت، ئەوەش لەبەرئەوەی مەحاڵە پشت بە لۆژیکی ئەقڵی تیۆری ببەستێت. جا ئەگەر مرۆڤ





گلەیی لەو نەزانینە تیۆرییە کرد، کە (حیکمەتی) خوایی وای ویستووە، ئەوا کانت وەڵامی بۆ ئەم حاڵەتە ئەوەیە، کە خوا ویستوویەتی کاری ناسینی و راستیبوونی ئەو و نەمری ئێمە بۆ خۆمان جێبهێڵێت، ئەوەش بە هۆی ویستێکی ئەخلاقگەرایییەوە دەبێت، کە مرۆڤ بەرەو بەختەوەری دەبات و ئەگەر زانیارییەکی گومان هەڵنەگرمان بە خودا و نەمری هەبووایا ئەوا ئەم زانیارییە خۆی لە خۆیدا دەبوو بە هێزێکی گەورەی فشارئامێز، کە فشار دەکاتە سەر ئیرادەمان. بەمەش ئیرادەیەکی پێبەخشیوون، کە بە هۆیەوە بتوانین بە بڕوا- ئیمان- بگەین.

هەر بەم جۆرەش کانت هەرسێ پرەنسیپەکانی (نەمری، سەربەخۆیی و خودا)ی تێکەڵ بە یەکتر کردووە؛ ئەویش بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

١- مرۆڤ ناتوانێت ئەرکی سەرشانی بەجێ بگەیەنێت تا ئازاد نەبێت.

٢- مرۆڤ ناتوانێت پیرۆزی بەدەست بهێنێت گەر نەمر نەبێت.

٣- مرۆڤ ناتوانێت بگاتە ئاستی چاکەی هەرە گەورە، گەر خوا بوونی نەبێت.

ئەم گریمانانە تیۆرنین، بەڵکو پرۆسەیەکی پێویستە لە عورفی فەلسەفەی (کانتیزم). بەم پێیە کانت بە دروستکردنی بوونیادێکی نوێ بۆ ئایین نەوەستاوە، بەڵکو ئەوەشی دەرخستووە، کە ئایین تەنها بیروباوەڕێکی



تیۆری نییە، بەڵکو کردەیەکی ئەفراندراوی ناخی بوونەوەرە یان بەندایەتییەکی تەواو رۆحی و بێگەردە.

بەم جۆرە دەبینین هەستی ئەخلاقی لە پایەییێکی بەرزتر دادەنێت تا پایەی بیروباوەڕ و سرووتە رووکارییەکان یاخود بەندایەتی رووکەش، لێرەشدا زۆر بە ئاشکرایی دەڵێت "هەموو ئەو خەیاڵانەی مرۆڤ دروستیدەکات، کە دەتوانێت بە هۆیەوە رەزامەندی خوا بەدەستبێنێت- جگە لە گرتنەبەری رێگایەکی ئەخلاقی چاك لە ژیاندا-، تەنها وڕێنەیەکی ئایینییە یاخود تەنها بەندایەتییەکی ساختەیە بۆ خودا".

کانت رەخنە لە خودان ئایینەکان دەگرێت، کە دەستیان بە رۆحی کتێبەکانیانەوە گرتووە و ئەوەی تریان پشتگوێ خستووە گرنگی تایبەتییان بە بەندایەتی رووکەش و توێژینەوە لە رووداوە مێژوویییە ئایینییەکان داوە، لە کاتێکدا ئەوەی بە لای (کانت)ەوە گرنگە، تێگەیشتنە لە رۆح و ناوەڕۆکی ئایین و لێکدانەوەی سیمبولی کتێبە ئایینییەکان و تاك کردنەوەی ئایین لە هەموو شتێکی دەرەکی و مێژوویی. ئەمەش مانای ئەو وتەیە دەگەیەنێت کە دەڵێت "پێویست بەوە ناکات کە بە دوای ئاییندا بگەڕێین لە دەرەوەی خۆمان، بەڵکو پێویستە لە ناخماندا بیدۆزینەوە". بەم جۆرە کانت هەوڵی لێکدانەوەی رووداوە ـ مێژوویییە- ئایینییەکانی داوە بە شێوەیەکی سیمبولی نوێ. بۆ ئەمەش دەبینین، کە هەوڵی لێکدانەوەی سەرەتای (هەڵەی ئادەم)ی





داوە، کە گوزارشت لەبەریەك کەوتنی ویست و هەستە، یاخود بەریەککەوتنە لە نێوان وڵاتی سەربەخۆیی و وڵاتی سروشت و، دەبینین بیرۆکەی (مەسیح، یا کوڕی خوا) بەوە لێکدەداتەوە، کە تەنیا گوزارشت لە پێوەرە ئەخلاقییەکانی ناخمان دەکات... تد.

کاتێك کانت باس لە کڵێسەی نەبینراو دەکات، مەبەستی (کۆماری ئەخلاقگەرایی)یە، یاخود (کۆمەڵگای ئایدیالیستی)یە، کە یاسای سەپێنراو تێیدا وەکو دەستوور وایە و (خودا) خۆی دەستووردانەری راستەقینەیە. کانت جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە. لێرەدا تەنها جێگایەك نابێت بۆ سیمبولە مێژووییەکان، کە هیچ رۆڵێکیان نابێت خەڵك بۆ گرووپ و پارتەکان جیابکەنەوە، لەم کۆمەڵگا ئایدیالیستەدا، کە لەسەر چەسپاندنی یاسای ئەخلاقی وەستاوە و لەبەرئەوەی تاکە سەرۆك، کە ئەندامانی کۆمەڵگا ملکەچی دەبن ئەو باوکە نەبینراوە بێت، کە فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن بەو پێیەی، کە وێنەی بەرزی ئەخلاقە، بۆیە باوەڕی ئەقڵانی حەتمەن دەبێتە تاکە پێکبەستێ، کە هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا پێکەوە دەبەستێتەوە. لێرەدا کانت گاڵتە بە مەسیحییەکان دەکات، کە ئەو نامەیەی پێغەمبەر (مەسیحی) لە پێناوچی؟! نێردرابوو لە بیریان چووەتەوە، کە بریتی بوو لە جێبەجێکردنی یاسای پادشای ئاسمان لەسەر زەوی "ئەوەتا ئێمە بوونەوەری پیرۆز دەبینین پادشایی ئێمە دەکات لە جیاتی پادشایی (خودا)، سەرەڕای ئەوەیش رێباز و سرووتە ئایینییەکان جێگای ژیانی





چاکی گرتووەتەوە لە بری ئەوەی خەڵك بە پێکبەستی ئایین پێکەوە ببەسترێنەوە. دەبینین مرۆڤایەتی دابەشبووە بەسەر هەزارەها جۆر و میللەت. کانت باوەڕی بە موعجیزە (معجزة) نییە، چونکە پێی وایە ناتوانێت لەسەر ئایین بێنێتەوە، ئەمەش لەبەرئەوەی ئێمە لە تواناماندا نییە پشت ببەستین بەو شایەتییەی کە پاڵپشتی لێدەکات، هەروەها- بەڕای ئەو- نوێژ بە کەڵك نایەت ئەگەر هاتوو ئامانجی وەستاندنی کاربێت بە هۆی یاسا سروشتییەکانەوە. بەم جۆرە و لە کۆتاییدا، ئایین دەگاتە ئەو ئاستەی، کە لە لادان (انحراف) بچێت، کاتێك کڵێسە دەبێتە ئامێرێك لە دەستی حکوومەتی کۆنەپەرست و پیاوەکانیشی دەبن بە ئامێری زۆرداری لاهووتی و سنوور بەزاندنی باری سیاسی.

دوای مردنی (شافردریك) لە ساڵی ١٧٨٦ و هاتنە سەر حوکمی (فردریك گلیۆم)ی دووەم "کە ئەمەیان دەمارگیر بوو" سەرەڕای بە توانایی و بەهێزی بیروبۆچوونە بوێرەکانی کانت، کەسێك گازاندەی لەسەر نووسراوەکانی نەبوو، چونکە لە لایەکەوە (کانت) بەساڵاچوو بوو و لە لایەکی تریشەوە؛ هەروەك چۆن یەکێ لە راوێژکارانی شا دەڵێت "ئەوانەی کتێبەکەی کانت دەخوێننەوە، تەنها دەستەیەکی کەمی خەڵکن ئەوانیش لێی تێناگەن" ئەوەندەشی نەبرد کە کتێبە ئایینییە بەناوبانگەکەی بە ناوی "ئایین لە چوارچێوەی ئەقڵی ئەبستراکت" نووسی، بەڵام دەسەڵاتی ئەوسا نەیانتوانی لە ئاستیدا بێدەنگ بوەستن، لەبەرئەوە رێگە بە بڵاوکردنەوەی نەدرا، بەڵام کانت هەنگاوێکی

بوێرانەی ئەنجامدا بە ناردنی کتێبەکەی بۆ "بینا" -کە دەکاتە دەرەوەی دەسەڵاتی پڕوسیا- و لەوێدا بڵاوکرایەوە، کەچی شای پڕوسیا چی پێنەکرا جگە لە ناردنی فەرمانێکی وەزارەتییانە و داوای پێشکەشکردنی پارەی لێکرد بە زووترین کات، هەروەها پەیمانی ئەوەش بدات، کە نووسراوی وەها خراپ دەرنەکات، ئەمە هەڕەشەیەکی شاردراوە بوو لە خودی کانت، بەڵام سەرەڕای ئەوەی کە کانت بڕیاری کارکردنی سەربەخۆی دابوو، کەچی پەیمانیدا بە درێژایی سەردەمی پادشای ناوبراو بێدەنگ بێت و شتی لەو جۆرە چیتر بڵاونەکاتەوە، تا وایلێهات لە دواییشدا بە تەواوی وازی لە دەرکردنی بەشەکانی تری کتێبەکە هێنا.



## بیروبۆچوونەکانی سەبارەت بە ئەخلاق

کانت حاشای لەوە کردووە کە ئەخلاق بەسترابێتەوە بە ئەنجامی کارەکانی مرۆڤەوە وەك چێژ و ئازار و سوود و زیان و، بەهای کردەکانی مرۆڤی لە ناخی ئەو (مرۆڤ)دا دانا، نەك لەو مەبەستانەی لە دەرەوەی ئەو کردانەدا ئەنجامدەدرێن، لەبەرئەوە ڕێبازەکەی کانت تیۆرێك بوو سەبارەت بە (فەرزەکان)، نەك تیۆرێك بێت سەبارەت بە (چاکە- خێر-)، ئەو چاکەیەی کەوا خەڵك یا خاوەنەکەی ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

بەم جۆرە کانت دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە چاکەخوازی تەنها شێوازێکی ئیرادەی ناخەو بەس و شتێکی تر لە ئارادا نییە، جگە لە ویست (ئیرادە) کە بۆ خودخێری هەیە، ئەم ئیرادە چاکخوازە ئارەزوو و مەبەست یان با بڵێین سۆز و ئارەزووە سێکسییەکان ناورووژێنن، چونکە ئەو کار و چالاکییانەی لەم هۆکارانە هەڵدەقوڵێن، بەهاکەی بە دەستەبەرکردنی ئەم مەبەستانە و تێرکردنی ئەم حەز و ئارەزووانەوە پەیوەستە. جا کاتێك ئەم ئارەزووانەمان ونبوون، ئەوا بەهای کار و چالاکییەکانیش نامێنێت. دواتر کانت ویستی ڕەفتاری ئەخلاقی ڕزگار بکات لە کۆت و بەندی ئەم حەز و ئارەزووانە بۆ ئەوەی بەهاکەی بە شێوەیەکی ڕەها لە ناخی مرۆڤدا بێت، بەمەش ئەوە بە دوور دەزانێت، کە چێژ و بەرژەوەندی و خۆشگوزەرانی مەبەست بن لە پشت ئەو





کردانەی کە دەکەونە ژێر کۆنترۆڵی مرۆڤەوە. ئەوەیشی کە پاڵنەرە بۆ جێبەجێکردنی فەرزەکان هیچ کاتێك حەز و ئارەزووەکان نین بۆ دەستەبەرکردنی ئامانج، بەڵکو پاڵنەر دەوەستێتە سەر خودی ئیرادە و، پێویستە ئەو پاڵنەرە تەواو وێنەیی بێت، واتە تەنها یاسایەکی شێوەیی بێت و بە واقیعەوە نەبەستراببێتەوە و لە ئەزموونیشەوە وەرنەگیرابێت و، دواتر گشتی و رەهابێت و مرۆڤ بتوانێت، کە بنچینەی رەفتارەکانی بکا بە یاسا لە هەموو کات و شوێنێکدا.

کانت دەڵێت: پێویست ناکات مانای گشتی چاکە و خراپە بەر لە یاسای ئەخلاقی (وەك وا دەردەکەوێت کە پێویستە ببێت بە بنچینەیەك بۆ ئەو مانا گشتییە) لەبەرچاو بگیرێت، بەڵکو پێویستە تەنها دوای یاسای ئەخلاق و بە یارمەتی ئەوەوە دەستنیشان بکرێت.

لەبەرچی دەبێت کانت سیفەتی رەهایی بۆ ئەخلاق دابنێت و لە سەرووی هەموو شتەکانی ناواخنی داناوە، کە شتێکی رێژەیی نییە بە جۆرێك هەموو ئارەزوو و سۆز و مەبەستەکان... تاد، تەنها بە دیاردە دادەنێت نەك بە هۆکار؟ واتە؛ لەبەرچی کانت مەبەستی ئەم وێنە میتافیزیقییە بۆ ئەخلاق؟ کانت خۆی وەڵام دەداتەوە و لە پێشەکی کتێبەکەیدا "بنەمای میتافیزیقای ئەخلاق" دەڵێت: پێویستە هەموو مرۆڤێك دان بەوەدا بنێت، کە یاسایەك هەیە و دەبێت ببێ بە یاسایەکی ئەخلاقی، مەبەستمە ببێت بە رێسایەکی ئیلتزامی کە دەبێت سروشتی زەروورەتێکی رەها لە خۆی بگرێت و ئەو



سەرگوزشتەیەی، کە دەڵێت؛ ((پێویستە درۆ نەکەیت)) ئەمە ناتوانرێت تەنها لەسەر مرۆڤ کورتکرێتەوە، بە جۆرێك کە پێمان وابێت بوونەوەرەکانی تر پەیوەندییان پێوەی نەبێت، کە ئەمە لەگەڵ هەموو یاسا ئەخلاقییەکانی تریشدا هەروایە. جگە لەوەش بنچینەی ئیلتزام (پەیوەست بوون) لێرەدا پێویستی بەوە نییە لە سروشتی مرۆڤ یاخود لە بارودۆخی ئەو جیهانەوە هەڵبقوڵێت، بەڵکو پێویستە بە شێوەیەکی پێشوەختی و زووتر بە دوایدا بگەڕێین و بە تەنهاش لە وێنە زەینییەکانی ئەقڵی ئەبستراکت- لە تاقیکردنەوە- هەموو فێرکردنە ئەخلاقییەکانی تر، کە لەسەر پرەنسیپەکانی ئەزموونی رەهاوە هەڵدەکەن، هەروەها تەنانەت ئەوانەشی کە بە شێوەیەك لە شێوەکان بە فێرکردنە گشتییەکان دەژمێردرێن، بە شێوەیەك لە شێوەکان بە فێرکردنە گشتییەکان دادەنرێت و لەسەر بنچینەیەکی ئەزموونگەری وەستاون، ئەگەرچی چەند شتێکی کەمی ئەو فێرکردنانە دەگرێتەوە، کە رەنگە یەکێك لەو پاڵنەرانە بێت کە هانی فێرکردنە ئەخلاقییەکان دەدەن. ئێمە ئەڵێین رەنگە بتوانین ئەم فێرکردنانە ناوزەدبکەین بە؛ بنچینەی رەفتاری زانستی، بەڵام بەهەر حاڵ ناتوانین بە یاسای ئەخلاقی ناوزەدیان بکەین.

بەم جۆرە یاسا سروشتییەکان لە یاساکانی تر جیا دەکرێنەوە، بەوەی کە هەر رەگەزێکی تاقیکاری هەبێت لە خۆی دەگرێت، نەك تەنها لە رووی جەوهەر و ناوەڕۆکەوە، جا ئەوە هەر فەلسەفەیەکی ئەخلاقی بێت





و به شێوەیەکی تەواو پشت به بەشێکی بێ خەوش (واتە ئەو بەشەی یاسا ئەخلاقییەکان، کە بەدەرە لە هەر تاقیکردنەوە و ئەزموونێك) دەبەستێت، و لە کاتی جێبەجێکردنی لەسەر مرۆڤـ، ئەوا کەمترین بەش لە دەربارەی زانیاری وەرناگرێت (واتە کەمترین بەش لە ئەنترۆپۆلۆژیا)، بەڵکو بەو پێیەی کە بوونەوەرێکی خودان ئەقڵە، بۆیە یاسا پێشوەختییەکانی پێدەبەخشێت، ئەوەش لە ڕێگای ئەزموونەوەیە، کە بێشك پێویستی بە حوکمێکی توند و بەهێز هەیە. بۆ ئەوەی لە لایەك ئەو حاڵەتانەی، کە دەتوانرێت لە سەری جێبەجێ بکرێت، جیا بکرێتەوە و، لە لایەکی ترەوە ڕێگە خۆشکەر بێت بۆ دۆزینەوەی ڕێچکەی بەرەو ویستی مرۆڤ (ئیرادەی) و کاریگەری هەبێت، ئەو کاریگەرییەی، کە دەبێتە هۆی مومارەسەکردنی، چونکە مرۆڤ ئەو بوونەوەرەیە، کە بە هۆی ناکۆکییەکان هەڵدەچێت (واتە دووچاری هەڵچوون دەبێت)، کە بە ڕاستی دەرککردنی هزری کردەیی ڕەها (ئەزموون و مەعریفەی مرۆڤ) بەهێز دەکات بەڵام ناتوانێت وایلێبکات کە کاریگەرییێکی کارای لەسەر ڕێڕەوی ژیانی مرۆڤ هەبێت.

لەم ڕوانگەیەوە کانت ئەوەی ڕەتکردەوە کە ئەخلاق لەسەر بنەما ڕێژەیی و ماددییەکانی دەستووری مرۆڤ دابمەزرێت، چونکە ئەم دەستوورانە جێگر و ڕەهانین (بە گوێرەی شوێن و کات دەگۆڕێن)، بەڵکو ئەخلاق لەسەر بنەمای جێگر و ڕەها، کە کرۆکی شتەکان لە خودیدا دەبینێت (واتە لەسەر ڕووە ڕاست و دروستەکەی)



دادەمەزرێنێت. بۆیە کانت پێی وایە کە (مەبدەئی) کەسێك ئەخلاقی دەبێت ئەگەر بێت و بە گوێرەی یاسای ئەخلاقی دەرببڕێت و ئەو یاسایەی لە شیکردنەوەی شارەزایی ئەخلاقی وێنەییە و بەدەرە لە ئەزموون (یاسایەکی ڕەهایە) وەك ئەوەی -کانت- بیەوێ بڵێت، کە یاسای سروشتی بوونی پێشوەخت هەبووە، واتە؛ بەر لە هەر چالاکییەکی مرۆڤ، ئەو چاکە و خراپەی کە مرۆڤ دێتەڕێی- کە ئەو پێی وایە- هۆکاری پەیدابوونی ئەم یاسایەیە. ئەو شتەش وا نییە، بەڵکو ئەم دوو شتە دیاردەن بۆ ئەو یاسایە. کانت (چاکە) بە دیاردەیەك دادەنێت بۆ یاسای ناوبراو، هەروەك دەڵێت: یاسای ئەخلاقی تاکە مەبدەئی یارمەتیدەرە بۆ ئیرادەی ئەبستراکتی مرۆڤ، بەڵام لەبەرئەوەی، کە ئەم یاسایە یاسایەکی شێوەیی ڕەهایە، مەبەستیشم لە شێوەیی ئەوەیە، کە تەنیا وەسفی شێوەی سوونەتی ئەدەبی دەکات بە شێوەیەکی گشتی وێنەیەکی ناتەواو پیشاندەدات، جا لەبەرئەوە بەو سیفەتەی، کە پرەنسیپێکی دیاریکراوی بەدەرە لە هەموو ماددەیەك، واتە بەدەرە لە هەر بابەتێکی پەیوەست بە ئیرادە، جگە لەوەی چاکەی باڵا لەوانەیە تەواو بابەتی سەرەکی ئەقڵی زانستی ئەبستراکت و ئامانجەکەی بێت. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە بە پرەنسیپێکی دیاریکراوی (ئەوی) دانەنێین، بەڵکو پێویستە تەنها یاسای ئەخلاقی جەختی لەسەر بکرێتەوە بۆ دەستەبەرکردنی چاکەی باڵا و بەرز نرخاندنی.





به رای کانت کاتێك کار چاك دەبێت، لەبەر ئەوە نییە کە ئەنجامی- کارەکە- چاك بێت یان کارێکی زیرەکانەو پیرۆزبێت، بەڵکو- لەبەرئەوەیە، چونکە لە ملکەچکردنی ئەو هەستەی ناواخنی (مرۆڤ)ەوە پەیدا دەبێت، ئەمەش ئەو یاسا ئەخلاقییەیە، کە لە شارەزایی کەسایەتیمانەوە هەڵدەقوڵێت، بەڵام بە شێوەیەکی (خۆفەرزکەر) دەستوور دادەڕێژێت بۆ رابردوو و ئێستا و داهاتووی رەفتارەکانمان و، تاکە شتی (بە چاوپۆشی لە سوود و زیانەکانی) ئەو یاسایەیە، کە لە ئەنجامی جێبەجێکردنیدا رووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە. سەبارەت بە ئێمە- ئەم یاسایە- بە راستی گرنگی بە خۆشگوزەرانی تۆ دەدات و هەڵدەستێ بە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی سەر شانت. داوای خۆشبەختی بۆ کەسانی تر بخوازین، بەڵام با داوای تەواوی کەماڵ بۆ خۆمان بخوازین، جا ئەمە بە خۆشی یان ئازار بۆمان بگەڕێتەوە. راستە کە جیهان کامڵ نییە، بەڵام با لەو ئاستەدا بژین و یاسای کامڵ لە دەوڵەتێکی ناکامڵ جێبەجێ بکەین و دیسان راستە، کە بە ئەخلاقی بوون توند و زەحمەتە، بەڵێ؛ زەحمەتە ئێمە ناتوانین ئەرك لە سەرووی جوانییەوە دابنێین و، ئەخلاق لە سەرووی خۆشگوزەرانییەوە، بەڵام تەنها بە پێی ئەو یاسا ئەخلاقییەوەیە کە وامان لێدەکات، کە وەکو دڕندە نەمێنینەوە، بەڵکو ببین بە خواوەند.

بەم جۆرە و بە پشتبەستن بەم هزرە قووڵە- کانت- دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئەم شتە رەهایەی ئەرك و فرمانە، سەربەخۆیی و ویستوو



ئیرادەمان دەسەلمێنێت، چونکە چۆن دەتوانین دەرك بە چەمکێکی وا بکەین، بەو پێیەی کە ئەرك و فرمانە، گەر هەستمان بەوە نەکردایە کە ئێمە سەربەخۆین. هەر بەم جۆرەش کانت چەمکێکی نوێ بۆ سەربەخۆیی دادەڕێژێت، ئەو کێشە سەختەی کە فەیلەسووفەکان لە توێژینەوەیان سەبارەت بەم چەمکە بە دەستییەوە گیریان خواردبوو. کانت لە سەرەتادا دان بەوە دادەنێت، کە هیچ رێگایەك نییە بۆ توێژینەوە سەبارەت بە سەربەخۆیی لە چوارچێوەی دیاردەکاندا، جا ئایا ئەمە مانای وایە، کە واز لە توێژینەوە بهێنن سەبارەت بە سەربەخۆیی، توێژینەوەیەکی میتافیزیقیانە؟ کانت هەوڵدەدات بابەتەکە بەوە چارەسەر بکات، کە بیگەڕێنێتەوە بۆ ئەنجامی ئەو جیاوازی کردنە بەناوبانگەی، کە بریتییە لە جیاوازیکردن لە نێوان ئەو دیاردانەی کە ملکەچی کات و شوێنن و ئەوانەشی کە ملکەچی کات و شوێن نابن، لەسەر ئەم بنەمایەش چالاکییە دەرەکییەکانمان شتێك نییە جگە لە سیمبوڵ یان رووکار و رووخساری دەرەوەمان، کە گوزارشت لە ناخمان دەکات (خودە راستەقینەکەمان). کەواتە ئێمە ملکەچی چەند یاسایەکین (چەند یاسایەکی زەروری) کە ملکەچی کات و شوێنن، کە لە جیهانی ئەزموونکردنمانەوە دێنەدی.

جا بۆیە چالاکییەکانمان پەیوەستە بە مۆتیڤەکانی پێش خۆی، پەیوەست بوونێکی زەروورییانە (واتە لەو مۆتیڤ و هاندەرانەی پێش خۆی)، جا ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە هەرگیز ئێمە سەربەخۆین؟ کانت وەڵام





دەداتەوە و دەڵێت: لە تواناماندا هەیە کە بڕیاری ئەوە بدەین بە شێوەیەکی سرووشتی ئێمە وەك دروستکراوێکی سرووشتی سەبەخۆین، جا ئەمە باش بێت یان خراپ و هەر خۆشمان ئەو دروستکراوە سروشتییە بە کارێکی سەربەخۆیانە ئەخولقێنین، کە سنووری کات دەبەزێنێت. بە هیچ شێوەیەك- ئەمە- پەیوەندی بە لایەنی هەستی و- ریژەییەوە- نییە، بەڵکو لە خودی راستەقینەیی خۆماندا هەیە، ئەو خودە ئەقڵیِ و (معقول) و نەبینراوە و کاتێك ریزبەندی لۆژیکی دەگاتە ئاستی پرسیارکردن لە چۆنیەتی دەرککردن بەم سەربەخۆییە لە خودی ئەقڵیِ کراوماندا، کانت ئەم شتە بە ئەخلاق دادەنێت، چونکە هەر ئەخلاقە کە دەتوانێت چارەسەری ئەم بابەتە بکات.

لە واقیعدا هەموومان هەست بە بەرپرسیارییەتی و ئەرکی سەرشانمان دەکەین و دەزانین کە ئەرك ئەو یاسایەیە، کە ئەوەی پێویستە ببێت دیاریدەکات.

بەم جۆرە دەبینین کانت نیگاکان بەرەو بوارێکی نوێ وەردەچەرخێنێت، بۆیە ئێمە هەر لەسەر ئاراستەیەکی لۆژیکی یان ئەزموونگەرایی نەماوینەتەوە، بەڵکو لێرەدا ئێمە لە چوارچێوەی بوارێکی ئەخلاقی داین، کە کۆڵەگەکەی بیرۆکەی هەبوونی هەستکردنە بە ئەرکی سەرشان.



## بۆچوونەکانی سەبارەت بە فیزیك (سروشت)

سەرەڕای گرنگی پێدانی زۆری (کانت) بە میتافیزیقا، ئەوا تا ئاستێکی بەرزیش گرنگی بە توێژینەوە سروشتییەکانیشی دەدا، کە ناسراوە بە فەلسەفەی سروشت. ئەو لە چوارچێوەی ئەم بوارەدا بە کۆمەڵێك نووسینی گرنگ ناوبانگی دەرکردووە، بۆ نموونە؛ لە ساڵی ١٧٤٦ز کانت توێژینەوە بچووکەکانی لە زانکۆ بە ناوی (بیروڕا سەبارت پێوانەی راست بۆ هێزە زیندووەکان) بڵاوکردەوە، لەم توێژینەوەیەدا کانت کەوتووەتە ژێر کاریگەری (کێشکردنی (نیوتن)ەوە، هەروەها لەم توێژینەوەیەیدا ئارەزووی خۆی پیشاندا بۆ دروستکرنی گونجانێك لە نێوان شوێنکەوتوانی ڕێبازی دێکارت و شوێنکەوتوانی ڕێبازی "لایبنتز" ئەویش سەبارەت بە پێوانەکردنی هێزی جوولێنەر. هەرچی نامەکەی (کانت)ە بە ناوی (مێژووی گشتگیری سروشت و تیۆری ئاسمان) لە سەرەتاوە راکانی وەها نیشاندا کە جیاوازن لە راکانی نیوتن، ئەمە کاتێك رەخنەی لە راکانی نیوتن گرت، کە دەیووت؛ پێکهاتەی سیستەمی ئێستای (هەتاو) (خۆر یا رۆژ) ناتوانرێت لێکبدرێتەوە تەنها لە ڕێگای یاسای میکانیزمی باری سروشتەوە نەبێت. جا کانت گریمانەیەکی لە بڕی ئەم رایە دانا و دەڵێت: (سیستەمی ئێستای ئەستێرەکانی ئاسمان لە سەرەتادا لەوانەیە بە کاری سووڕانەوەی بنچینەی





(شوێنێك) بێت (كە لە ئاسماندا رووناكی تێیدا كەمە، هەندێك لە هەسارەكانی دەگرێتەوە خۆی- سەدیم-). ئەم گریمانەیە تا رادەیەكی زۆر لە گریمانەكەی زانای فەرەنسی (لابلاس) دەچێت، تا ئەو رادەیەی كە تیۆری (سەدیمی سەبارەت بە ئەستێرەكانی ئاسمان) بە تیۆری (كانت- لابلاس) ناوزەدكراوە لە لێكدانەوەی بنچینەی گەردوون. هەندێ لە زانایان پێیان وایە، كە لابلاس پەرەی بە تیۆرەكەی داوە لەسەر بنەمای پێشنیارێك، كە كانت لە ساڵی ١٧٥٥ پێشكەشی كردووە و دەڵێت: سیستەمی (خۆر) لە بنەڕەتدا وابینراوە، كە (سەدیم)ێكی گەورە، خاڵی ناوەندی بێت. كە ئەمەش بە رۆڵی خۆی وایكردووە پارچە سەدیمێكی نوێ دروست بێت، كە هەسارەكانی لێوە پەیدا بووە، سەرەڕای ئەوەی كە ئەم تیۆرە زۆر دەستكاری كراوە (لایداوە) و گریمانەی هەسارەیی بۆ زیاد كراوە، كە لە رواڵەتدا وا دەردەكەوێت- ئەم هەسارانە- نزیكن تا ئەوەندەی ئێمە چاومان دەتوانێت بڕی بكات لە گشت پارچە سەدیمە شێوە سپرینگرەكان لە ئاسمان، لەگەڵ ئەوەشدا زانایانی فەلەكناسی بە شێوەیەكی گشتی قبووڵیانكردووە. لە سەرووی ئەمانەشەوە كانت هەوڵی داوە لێكدانەوەیەكی میكانیزمی بۆ هەموو جووڵە و پەرەسەندنی ئەم دوو لایەنەی هەسارەكان دابنێت، چونكە هەموو هەسارەكان- بە بڕوای ئەو-یان خەڵكی لەسەر بووە یانیش خەڵكی لەسەر دەبێت (لە داهاتوودا)، هەروەها دەڵێت؛ لەوانەیە دوورترین هەسارە لە (خۆر) سیستەمی ئەندامی و ئەقڵانی تێدابێت، كە



بەرزتر و رێكتربێت لە هەر سیستەمێكی ئەندامی هەسارەی زەوی، كە تا ئێستا هێنابێتییە كایەوە. ئەمەش لەبەرئەوەی ماوەی پەرەسەندنی ئەو هەسارانە درێژترە.

رەنگە بەهێزترین ئەو بۆچوونانەی كانت سەبارەت بە سروشت، تیۆرەكەی بێت سەبارەت بە سەرهەڵدان و بەرەوپێش چوون (ارتقاء) هەروەك چۆن لە ساڵی ١٧٨٨ لە كاتی وتنەوەی دەرسگوتارەكانیدا روونی كردووەتەوە، كە دەكرێت بنچینەیەكی ئاژەڵی بۆ مرۆڤ بخەملێنرێت، هەروەها مرۆڤ بە گوێرەی بارودۆخی جیاوازی سروشت ئەوا لە رووی جەستەوە گۆڕانی بەسەردا دێت.

جگە لەوەش كانت كۆمەڵێك توێژینەوەی تری بڵاوكردووەتەوە لە بوارە جیاجیاكانی فیزیا، لەوانەش“ كتێبەكەی (لە هۆكارەكانی بوومەلەرزەی زەوی، ساڵی ١٧٥٦) و توێژینەوەیەكی لە بارەی (مێژوو وەسفی لێكدانەوەی تیۆری با، لە هەمان ساڵدا) و وتاری (نەخۆشییەكانی سەر، ساڵی ١٧٦٤) و توێژینەوەیەكیش بە ناوی (جیاوازییەكانی نێوان رەچەڵەكە "سلالات" مرۆڤایەتییەكان، ساڵی ١٧٧٥) و دواتر توێژینەوەیەكی بە ناوی (كاریگەری لەسەر ئاو و هەوا، ساڵی ١٧٩٤) و توێژینەوەیەكیش بە ناوی (پێناسەكردنی چەمكی ڕەچەڵەكە مرۆڤایەتییەكان، ساڵی ١٧٨٥) و كتێبە بەناوبەنگەكەی (جوگرافیای سروشت)، ساڵی ١٨٠٢، بڵاوكراونەتەوە.





## بۆچوونە سیاسیەکانی کانت

سروشتی دەروونی و کۆمەڵایەتی کانت بوو، کە حەزی لە وروژاندن و تورەکردنی ناوەندە حکومییەکانی پروسیا نەبوو، بەوەی کە لە دژیان بووەستێت، بەڵکو حەزی بە ژیانێکی هێمن و ئاسایی و دوور لە کێشە دەکرد، وەکاتێك کانت کتێبێکی لە دەرەوەی پروسیا بڵاوکردەوە، دەسەڵاتی ئەوسای وڵاتی تورە کرد، بەڵام خێرا داوای لێبووردنی خواست بەمەش گرفتەکەی چارەسەرکرد و بارەکە ئاسایی بووەوە.

شتێکی سروشتییە گەر ببینین کانت دوور دەکەوێتەوە لە هەموو شتێك، کە پەیوەندی بە دەوڵەت و سیستەمە سیاسییەکەیەوە هەبێت، تا وایلێهاتووە بۆچوونەکانی سەبارەت بە سیاسەت نازانین، بەڵام لە ڕۆژانی کۆتایی تەمەنی و لە دوای شۆڕشی فەرەنسی ساڵی ١٧٩٥ کتێبێکی بە ناوی (پرۆژە بۆ ئاشتی هەمیشەیی) بڵاوکردەوە. ئەم کتێبە کۆمەڵێك بوار دەگرێتەخۆ، یەکەمیان؛ ئارەزووی کانت سەبارەت بە شێوەی حکوومەت، دووەمیان؛ ئارەزووەکانی سەبارەت بە دیاریکردنی شێوەیەکی نوێ بۆ سیستەمی سیاسی جیهانی. ئەمەو جگە لەو بۆچوونە گرنگانەی، کە سەبارەت بە فەلسەفەی مێژووە، ئەم کتێبە لە خۆی گرتوون. لەم بەشەدا تەنها بۆچوونە سیاسییەکانی کانت دەخەینە ڕوو، دەتوانین پرسیارێك بورووژێنین، ئایا کانت ئومێدی چ جۆرە سیستەمێکی سیاسی دەخواست بۆ



وڵاتەکەی (پروسیا)؟ کانت دەڵێت: پێویستە دەستووری شار لە هەموو دەوڵەتێك کۆماری بێت و تاکە دەستووری وەرگیراو لە بیرۆکەی (گرێ بەندی بنەڕەتی)، کە پێویستە هەموو دەستوورێکی یاسایی میللەتان لەسەر ئەوە بەرپابێت، ئەویش بریتییە لە دەستووری کۆماری، چونکە ئەم دستووره پابەندە بە:

١- مەبدەئی ئازادی، کە ئەندامانی گرووپێك دەبنە خاوەنی (بەو پێیەی کە ئەوانە تاکگەلێکن).

٢- مەبدەئەکانی شوێنکەوتنی هەموو ئەندامان بۆ تاکە دەستوورێکی هاوبەش.

٣- یەکسانی لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگا (بەو پێیەی کە هاوڵاتین).

کەواتە ئەم دەستوورە خۆی لە خۆیدا بنەڕەتێکە و هەموو جۆرەکانی دەستووری شاری لەسەر بنیاد دەنرێت.

ئەگەر بێت و سەرنجی سروشتی سیستەمی زۆرداری (پروس)ی بدەین، کە کانت لە ژێر سایەی ئەو سیستەمەدا ژیاوە، دەرك بەو بۆچوونە چاونەترسانەی کانت دەکەین. کە ئەمانە بۆچوونی نوێن ئەو پێی وایە موڵکداریەتی، (بەتایبەتی گەر زۆرداربێت) بنەمای هەموو هەڵەیەکە و، هەر ستاتێك بوونێك لە پێشکەوتن، کە تووشی وڵاتان بێتەوە ئەو پێیی وایە بریتییە لە هۆکارە سەرەکییەکانی دروستبوونی شەڕ، هەروەها (ئەو) ئارەزووە ڕاستەقینەشی دەربڕیوە، کە لە بارەی





هەبوونی چەند دەستوورێك، كە هیچ نرخێك پایەوپێگەی چینەكان دانەنێت، بەڵكو لەسەر بنەمای یەكسانی ڕەها مامەڵە لەگەڵ ئەندامانی كۆمەڵگادا بكات.

لە شوێنێكی تردا، كانت دان بەوەدا دەنێت، كە هێنانەدی وێنەیەك لەم دەستوورە، كە ئومێدی بۆ دەخوازێت، ئەستەم و قورسە، دەڵێت؛ دەستووری كۆماری تاكە وێنەیە، نوێنەری مافەكانی مرۆڤ بێت و هەڵكردن و دامەزراندنی ئەم دەستوورەش یەكجار سەختە، كە وێنەیشی كەمە و زۆریش بەردەوام نابێت وەكو ئەوانی تر.

بۆیە زۆربەی زانایان پێیان وایە، كە هەڵكردنی وێنەی ئەم جۆرە دەستوورە پێویستی بە گرووپێك یاخود میللەتێك لە فریشتە هەیە، چونكە خەڵك بەو سروشتەی كە هەیانە لە خۆپەرستی، بەرژەوەندی خوازی توانای گەیشتنیان بەم دەستوورە چاكە و ئاست بەرزە نییە، گەر وابێت بە ڕای ئەو، ئەم پاڵپشتییە یان ئەو بنەمایە چییە، كە ئەم جۆرە سیستەمەی لە سەر دروستدەبێت؟ لێرەوە كانت دەچێتە سەر بیرۆكەی ناسیۆنالیزم و ئیرادەی نادیار و كەڵەكەبووی ناخی ئەندامانی میللەتێك، كانت دەڵێت: ((بەڵام خودی سروشت ئەم حەز و ئارەزوو و بەرژەوەندیخوازی و خۆپەرستییە دەستەبەر دەكات))، كە یارمەتیدەری ئیرادەی گشتی بێت كە پابەندە بە ئەقڵەوە، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو ڕێز و شكۆمەندەی كە پێی بەخشراوە، بێ توانایە لە كار و جێبەجێكردن. لە پێناو ئەوەشدا بۆ دەوڵەت بەسە، كە سیستەمێكی باشی هەبێت



(ئەم شتە لە توانای خەڵك بەدەرە) كە هێزە مرۆییەكان یەكبخات و سنوور بۆ پاشماوەی ڕق و كینە بەرامبەر یەكتر دابنێت، یاخود بەشێوەیەكی تەواو بنبڕی بكات.

كانت ڕقی لە زۆرداری دەسەڵاتدارە سەربازییەكانی وڵاتی پروسیا دەبووەوە و، پێیی وابوو ئەم زۆرداریییە میللەت بەرەو شەڕكردن ڕاپێچ دەكات و تاكە چارەسەری بۆ ڕێگەگرتن لەم بارە ناهەموارە ئەوەیە، كە لە جیاتی ئەو شەڕە ئەنجامدانی چاكسازی یەك لە دوای یەك و دروستكردنی سیستەمی دیموكراسییە. پلەی بوێری كانت دەگاتە ئەو ئاستەی (كە خۆی پیاوێكی نەرم و نیانی بڕوا بە سیستەم) بانگەشەی ئەوە بكات، كە ئەستەمە ئەم دەستوورو سیستەمانە بهێنرێنە دی گەر لە ڕێگای شۆڕشەوە نەبێت. گەر لە یادمان بێت كانت كتێبێكی نووسیبوو بەناوی (پرۆژەیەك بۆ ئاشتی هەمیشەیی لە ساڵی ١٧٩٥) واتە دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسی، لێرەدا پلەی گرنگی ئەم شۆڕشەمان بۆ دەردەكەوێت لەلای كانت، بەو پێیەی كە ئەمە یەكەم هەنگاوە بۆ ڕزگاربوونی ئەوروپا لە سیستەمی زۆرداری و چەوساندنەوەی كۆن و گۆڕینەوەی ئەم سیستەمە بە سیستەمێكی كۆماری و دامەزراندنی سیستەمێكی نێودەوڵەتی، كە پشت بە دیموكراسی بوون ببەستێت و جێگای كۆیلایەتی و چەوساندنەوەی تێدا نەبێتەوە و دەوڵەت هەموو كۆشش و تواناكانی یەكبخات لە پێناو ئاشتی. ئینجا دوای چەند پێشبینیكردنێك (كانت) دەگاتە ئەو





ئەنجامەی دیموکراسی شتێکی حەتمییە. کانت دەڵێت: ((کەواتە دەتوانین بڕیار لەسەر ئەوە بدەین کە هەر چەندە ژمارەی ئەو کەسانەی دەسەڵاتی سیاسی دەگرنە دەست کەم بێت و هەرچەندە نوێنەرایەتیکردنیان زیاتر بێت سیستەمی سیاسی زیاتر لە سیستەمی کۆماری نزیك دەبێتەوە، لێرەوەش ئومێدێك دروست دەبێت بۆ پرۆسەی چاکسازی بەردەوام و یەك لە دوای یەك، لەبەر ئەوە گەیشتن بەم دەستوورە کۆمارییە، کە تاکە دەستووری کامڵە، لە سیستەمێکی ئەرستۆکراتیدا بە زەحمەتتر پیادە دەکرێت تا سیستەمێکی پاشایەتی. هەرچی لە سیستەمی دیموکراسییە، ئەوا تەنها لە ڕێگای شۆڕشێکی سنوور بەزێنەوە دەتوانین بە سیستەمی کۆماری بگەین)). بەم جۆرە دەبینین گەرچی (کانت) لە چینگەیەکی نەزان و کۆنەپەرست دا ژیاوە و لەگەڵ ئەوەی، کە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپای پاشایەتی یەکیانگرتبوو بۆ ڕێگاگرتن و لەناوبردنی شۆڕش، لەگەڵ ئەوەشی کە تەمەنی (کانت) (٧١) ساڵ بوو، کەچی زۆر بەئاشکراو بوێرانە شان بە شانی سیستەمی نوێ دەوەستێت و بانگەشەی سیستەمی دیموکراسی دەکات و لە هەموو شوێنێکدا پاڵپشتی لە سەربەخۆیی دەکات.






## بۆچوونەکانی سەبارەت بە ناسیۆنالیزم

بۆچی (کانت) دامەزراندنی سیستەمێکی دیموکراسی بە کارێکی پڕ بایەخ دەزانی لە گەیشتن بە چاکە و خێری کۆمەڵگا و ڕێگەگرتن لە شەڕ و شۆڕ بەرقەراربوونی ئاشتی و سیاسەتی دەوڵەتی بەستووەتەوە بە کێشەی ئاشتی نێو دەوڵەتی؟ لەڕاستیدا ناتوانین وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە تەنها لەسەر بنچینەی نەتەوایەتی نەبێت. ئیرادەی گشتی کە فەیلەسووفەکان باوەڕیان پێی هەبووە، کە بە نوێنەری ڕاستەقینەی خودی ئیرادەی سروشتییان داناوە. کانت باوەڕی وابوو، کە هەموو چاکەیەك لەوەوە دروستدەبێت، کە بوار بۆ دەرکەوتنی ئەم ئیرادەیە بڕەخسێنێت، کە لەسەر دەستی ئەودا ئاشتی گشتی بۆ مرۆڤایەتی زامن بێت.

نەتەوایەتی ئەو ئیرادە گشتییەیە، میللەت لەگەڵ یەکتردا کۆ دەکاتەوە و یەك ئامانج هەبێت، کە ئەمەش لە ناخی تاکەکانی خودی ئەم میللەتەدا هەیە. جا ئەگەر هەموو ئەندامانی میللەت لە دەستەیەکدا کۆبوونەوە، ئەوا ڕۆحی نەتەوایەتی لە نێو ئەو دەستەیەدا و لەسەر شێوەی ئیرادەی گشتی دەردەکەوێت، ئەگەر هاتوو دەستووری وڵات لەم ئیرادەیەوە وەرگیرابێت ئەوا دروستی یاساکان مسۆگەر دەبێت (ئەویش کە تاکە دەستووری کامڵە) جا ئەگەر بێت و یاساکانی میللەتان لەم ڕۆحەوە هەڵقوڵابێت لە ڕێگای نوێنەرایەتی کردنی میللەت بە گشتی،

ئەوا یاسای ڕاست و دروست و کامڵ دەدۆزینەوە، مادام دروستی و کامڵی گەورەترین کۆڵەکەیە (پاڵپشتە)، کە ئەم یاسایانە بە جیاوازییەکانیانەوە هەموو پێکەوە کۆ دەکاتەوە، بەمەش ئەم یاسایانە بەشێوەیەکی سروشتیانە بەیەك دەگەن، کە حەتمەن دەبێتە هۆی بڵاوبوونەوە و بەرقەرار بوون و بنبڕکردنی شەڕ و شۆڕ.

هەربەم جۆرەش (کانت) لە فەلسەفەکەیدا سیستەمێکی کۆماری بە بیرۆکەی نەتەوایەتی (ناسیۆنالیزم) و ئاشتی جیهانی بە تاکە پێکبەستی بەهێز بەستووەتەوە. دەستووری کۆماری، سەرەڕای پاکی و بێگەردی سەرچاوەکەی، کە لە کانیاوێکی تایبەتییەوە هەڵقوڵاوە، ئەویش بیرۆکەی ڕاستگۆییە، بەوە دەناسرێتەوە، کە لە ئاسۆیەکی دوور ئەو ئەنجامەمان پیشاندەدات کە چاوەکانمان لە ئاستیدا داخراون، لێرەدا مەبەستم ئاشتی هەمیشەییە.

بەڕای کانت لە ڕێگای ئەقڵیەتێکی خاوەن ئەزموونەوە ناتوانین بە ڕاستی بگەین. (واتە؛ لە ڕێگای مەعریفەی بەرهەمهاتوو لە ڕێگای ئەزموونی مادییەوە)، بەڵکو لە ڕێگای گیانی گرووپییەوە پێی دەگەین (واتە؛ لە ڕێگەی گیانی نەتەوایەتییەوە). کانت ئەم چەمکە زیاتر فراوان دەکات بەهۆی ئەو گرێبەندییەوە بەناوی مەبدەئی گرووپی) کە تێیدا دەڵێت: (( هەموو دیاردەکان بەو شێوەیەی کە هەن لە گرووپێکی کامڵدا بوونی دەبێت، واتە لە بارێکی ئاڵوگۆڕی سوود و قازانج بۆ یەکتردا دەبن)). ئەم بیرو ڕایانەی کانت سەبارەت



بە ناسیۆنالیزم کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە ئەڵمانیا لە سەدەی (١٩). زۆربەی فەیلەسووفانی ئەڵمانیا بە پیری ئەم بیروڕایانەوە چوون، کە لە دواییدا پەرەیان پێدا. نموونەی ئەو فەیلەسوفانەش، هیگڵ و هردەرو نیتچە ... تاد و هێندەشی نەبرد، کە ناوبانگێکی سیاسی گەورەی پەیداکرد، کە نەك تەنها ئاڕاستەی سیاسەتی ئەڵمانیای گۆڕی، بەڵکو مێژووی ئەورووپای بەگشتی گۆڕی، ئەمەش سەرەتایەك بوو بۆ سەردەمی ئایدیۆلۆژیا ناسیۆنالیستەکان لە جیهان.





## بۆچوونەکانی سەبارەت بە ئاشتی جیهانی

بینیمان چۆن (کانت) سیستەمی دیموکراسی کردە ئامرازێك بۆ گوزارشتکردن لە گیانی نەتەوایەتی، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا مافی هەموو گەلێکەوە شتێکی ئاساییە کە هەوڵی دەستپێکردن و دامەزراندنی پرۆژەی جیهانی بدات بۆ ئاشتی هەمیشەیی لە ژێر ناونیشانی (پرۆژەیەك بۆ ئاشتی هەمیشەیی)، ئەنجامێکی لۆژیکی ئەم بیرۆکەیە بوو بەجۆرێك ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ وتەکانی (کانت) ـ پێش ئەو پرۆژەیە ـ دەبینین چەندین جار ئاماژە بەوە دەکات کە شەڕ پاشماوەیەکی شارستانی هەیە لە مێژوودا، وەك ئەو وتەیەی کە لە کتێبی (ڕەخنە لە شاژنی حوکم ساڵی ١٧٩٠) دا هاتووە، کە دەڵێت: (شەڕ بەو پێیەی هێزێکی گەورەیە لە هێزە جوان و سەرسوڕهێنەرەکانی سروشت، کەچی لە کاتێکدا لەوانەیە ئاشتی درێژخایەن لەگەڵ گیانی کارو بازرگانی جۆرێك لە خۆپەرستی و بەرژەوەندیخوازی گشتی و ئاڵۆزی دروستبکات لەگەڵ ئەوەشدا لە کتێبەکەیدا (چەند گریمانەیەك سەبارەت بە دەستپێکردنی مێژووی مرۆڤایەتی ساڵی ١٧٨٦) ڕایگەیاند، کە گەورەترین خراپەکاری ڕووبەڕووی میللەتە خاوەن شارستانییەتەکان بووەتەوە لە شەڕەوە سەر هەڵدەدات، نەك بەمانای ئەوەی کە شەڕی ئێستا یا ڕابردوو، بەڵکو ئامادەباشی بەردەوام بۆ شەڕی داهاتوو). هەروەها کانت دانیشی بەوەدا نا کە ترس لە شەڕو



شۆڕ بەهێزترین پارێزەرە بۆ مسۆگەر کردنی سەربەخۆیی و لەناوبردنی چەوساندنەوە، چونکە زۆردارو چەوسێنەران خۆیان ناتوانن واز لە سەروەت و سامانی نەتەوەیی بێنن، کە لە ژێر سایەی ئاشتی و سەربەخۆیی نەبێت پەرەناسێنێت.

لە ماوەی سەرنجدانی مرۆڤ بۆ مێژووی بڵاوکردنەوەی نووسینە سیاسییەکانی کانت، لە سەرووی هەموشیانەوە (پرۆژەیەك بۆ ئاشتی هەمیشەیی)، کە هەموویان لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی فەڕەنسی و نەمانی سەردەمی چەوسانەوە و نەهێشتنی حوکمی ڕەهادا (دەرچوون) بە جۆرێك ئەو بۆچوونە دروستدەبێت بەوەی، کە کانت سەرکەوتنی ئەو شۆڕشەی وەك سەرەتایەکی باش دانا بۆ ڕێکخستنی میللەتان. ڕێکخستنێکی ناوخۆییانە لەسەر بنەماگەلی کۆماری، بۆ ئەوەی ببێت بە سەرەتایەکی گرنگ بۆ دامەزراندنی کۆمارێکی جیهانی گشتگیر. پرۆژەکەی کانت لەسەر شێوەی بابەتی دیاری کراودا نووسراوە و ئەویش لە پێناو زامنکردنی ئاشتی هەمیشەییدا. مەرجە گرنگەکانی کە وا دەکات کۆتایی هێنان بە شەڕەکان کارێکی ئاسان بێت، لە ڕاستیدا ئەم بابەتە بە حوکمی شێوازە یاساییە ڕەهاکەی هەندێ جار بیروڕای یەکجار دوور و قووڵ لەخۆ دەگرێت لە لێکدانەوەی مێژووی مرۆڤایەتی جا کاتێك هەوڵی کۆتایی هێنانی شەڕەکانی لە داهاتوودا دەدات ئەوا زۆر هەوڵ دەدات بۆ زانینی هۆکارە ڕاستەقینە شاراوەکانی دواوەی ئەم شەڕانە، چونکە ئەو





دەزانێت کە هیچ ڕێگایەك نییە بۆ کۆتایی پێهێنانی کێشە، تەنها لە ڕێگەی زانینی هۆکاری دروستبوونەوەی نەبێت، گرنگی ئەم بیروڕایانە لەوەدا دەردەکەوێت، کە پێداگیری لەسەر لایەنی ئابووری دەکات بۆ وروژاندنی شەڕ، کە چاوبڕینە سەر ئابووری و ماڵ و سامان و قەرزە نیشتمانییە گەورەکان و زۆربەی تریش لەو کێشە ماددیانەن و، هۆکاری سەرەکین بۆ پڕ چەککردنی ڕای گشتی بۆ شەڕکردن و دواتریش شەڕکردن لە پێناو ڕزگاربوون لە کێشەی داهات و سامان، کە وڵات بەدەسیەوە دەناڵێنێت. ئەم ڕایەش خۆی لە خۆیدا بنەمای چوارەمە لە پڕۆژەکەی کانت جا با ئێستا چاوێکی توێژەرانە بخشێنین بەسەر ماددەکانی ئەم پڕۆژەیە، کە ئەوانیش بەگشتی بریتین لە:

١- پەیمان بەستنی ئاشتی دانی پێدانانرێت، ئەگەر نیازی پەیمان بەستووەکان لەسەر شتێك بێت، کە لەوانەیە سەر لە نوێ شەڕ دروستبکاتەوە. لێرەدا (کانت) هەوڵدەدات ئەگەری شەڕ و نیازی شەڕکردن نەهێڵێت. هەرچی شتێ دەربارەی ئەم نیازەی (کانت)ە ئەوا لە ماددەکانی تردا زیاتر ڕوونی دەکاتەوە.

٢- هەر دەوڵەتێکی سەربەخۆ، بچووك بێت یان گەورە، هیچ دەوڵەتێکی بێگانە بۆی نییە دەستی بەسەردا بگرێت، بە بیانووی میرات یان ئاڵوگۆڕکردن یان فرۆشتن یانیش بەخشین، چونکە دەوڵەت کاڵایەك نییە (وەکو پارچە زەوییەك)، بەڵکو دەوڵەت گرووپێکی مرۆییە و هیچ کەس بۆی نییە دەسەڵاتی بەسەردا بسەپێنێت، جگە لە



دەسەڵاتی خودی دەوڵەتەکە خۆی نەبێت. چونکە دەوڵەت وەکو قەدی درەخت وایە و ڕەگ دادەکوتێ و لق و پۆپی تایبەتی هەیە، جا لەبەر ئەوە لکاندنی بە دەوڵەتێکی ترەوە، وەك ئەوە وایە ڕووەکێك بێت و بە ڕووەکێکی تر پێبگەیەنرێت ئەمەش مانای هەڵکەندنی ڕووەکەکەیە لەڕەگ و ریشەوە. لەبەر ئەوە ئەمە مانای بەدەرکردنی لە کەسێتییە مەعنەوییەکەی دەگەیەنێت، بەجۆرێك کە ئەو تاکە وا دابنێت لەو پەیمانە ناتوانرێت وێنەیەکی زەینی دروستبکرێت لە بارەی بەخشینی ماف بە ئەندامانی میللەت و هیچ کەسێك نییە نەزانێت چۆن ئەوروپا کەوتە مەترسییەوە تا دەگاتە حاڵی حازرمان، ئەمەش بەهۆی خەیاڵی خۆ بە زلزانینی ئەوروپییەکان. خەڵك وایکرد کە ئەمەشیان بەسەر بێت، کە خەیاڵیان ئەوەی لەبەرچاو جوان دەکردن، کە دەوڵەتان خۆیان بۆیان شیاوە ژن و ژنخوازی لە نێوان خۆیاندا بکەن، ئەمەش ساختەکردنێکی نوێیە کە دەوڵەتان دروستیدەکەن، بۆ ئەوەی بگەن بەوەی دەسەڵاتیان بەسەر ئەوانیتردا بشکێت. لێرەدا (کانت) گورز لە بەرژەوەندی بنەماڵە فیودالیزم و خاوەن دەسەڵاتەکانی ئەوروپا (سەردەمی خۆی) دەدات. ئەمانیش ئەو بنەماڵانە بوون کە بانگەشەی بە میرات مانەوەی دەسەڵاتیان دەکرد لە وڵاتدا. بۆچوونەکانی کانت بەڵگەیەکە بۆ مایەپووچی بانگەشە فیۆدالیزمە کۆنەکان، لە هەمانکاتدا پاڵپشتییە بۆ گیانی نیشتمان پەروەری و نەتەوایەتی، کە سەربەخۆیی بە یەکەم مەرجی سەرەکی خۆی دادەنێت.





٣- پێویسته هێزه سەربازییه هەمیشەییەکان هەڵبوەشێنرێنەوە جا له هەر قۆناغێکی مێژووییدا بێت، کانت ئەم شته بەوه لێکدەداتەوه که بوونی هێزی سەربازی، هەمیشەیی هەڕەشەیەکی بەردەوامه بۆ ئاشتی گشتی، ئەمه سەرەڕای ئەوەی، که کرێیەك دەدرێت به سەرباز بۆ ئەوەی به کوشتنی ئەوانیتر ژیانی مسۆگەر بکات، هەروەها رۆژێك دێت ئەویش (سەربازەکه) دەکوژرێت، واته مامەڵه کردن لەگەڵ سەرباز وەك مامەڵه کردنه لەگەڵ ئامێرێك نەك وەك لەگەڵ مرۆڤێك.

٤- له دوای ئەوەی کانت ئاوڕێك بەلای لایەنی ئابووریدا دەداتەوه، له دروستکردنی چاوتێبڕین و دەستدرێژیکردن، که هۆکاری سەرەکین بۆ هەڵگیرسانی ئاگری شەڕ و دەڵێت: پێویسته پەیمان لەسەر قەرزی یەکجار زۆر نەبەسترێت، که سنووری نەبێت، نموونەی ئەو جۆره سیستەمەی که داهێنانی سەردەمه بۆ گەلێکی بەهرەمەند به بازرگانی، ئەمەش ئاماژەیه که بۆ چینی بۆرژوازی بازرگان، که به شێوەیەکی بەرفراوان له ئەوروپا سەریهەڵدا، که لەو سەردەمەدا گرنگی هەبوو، ئەمەش به هۆکارێك دادەنرێت بۆ دەستتێوەردانی هەندێ دەوڵەت له کاروباری دەوڵەتانی تر، هەروەها به هێزێکی ماددی مەترسیدار له قەڵەمدەدرێت بۆ هەڵگیرسانی شەڕوشۆڕ لەسەر هەموو ئەو داهاتانەی که وڵاتانی تر هەیانه و لەسەری کۆکن و ژیانی خۆیانی پێوه بەڕێوەدەبەن. هیچ ڕێگایەك نییه بۆ دەربازبوون لەم حاڵەته تەنها به ئیفلیجییەکی چاوەڕوانکراوی باج نەبێت.



٥- شتێکی قەدەغەیه و نابێت هیچ دەوڵەتێك بەهۆی هێزەوه خۆی له کاروبار و سیستەمی دەوڵەتێکی تر یا حکوومەتەکەی هەڵقورتێنێت. ئەم ماددەیەش ڕاستەوخۆ گوزارشت لەوه دەکات، که میللەتان هەروەکو تاکه کەس ڕێز و پایەی هەیه و هەر خۆی مافی چۆنییەتی بەڕێوەبردنی کاروباری حکوومەتەکەی هەیه.

٦- بۆ هیچ دەوڵەتێك نییه لەکاتی شەڕ لەگەڵ دەوڵەتێکی تر، که کاری دوژمنکاری وەك هاندانی خیانەتکردن لەکاتی شەڕدا، ئەنجام بدات، کەوا ڕەنگه له دوای جەنگ دووباره بەرەو ئاشتی بگەڕێتەوه، ئەمەش لەوانەیه وابکات متمانه له نێوان دوو وڵاته شەڕکەرەکه لاواز بێت یان نەیهێڵێت.

لێرەدا (کانت) مەبەستی له شەڕی نێوان دەوڵەتان، شەڕێکی خاوێنه، که فێڵ و هەڵخەڵەتاندنی تێدا نەبێت، که ئەمه لۆژیکێکی پێچەوانەیه، چونکه یان ئەوەتا دەبێت شەڕ هەبێت و دەوڵەت هەرچی ڕێگایەکی بەدەستەوه بێت بەکاری بهێنێت، یانیش بۆ تەنها جارێکیش شەڕ ڕوونەدات، واته چارەسەرێکی نێوەندی نییه لەم حاڵەتەدا.

له دوای ئەوەی (کانت) مەرجه سەرەکییەکانی ئاشتی دەخاتەڕوو بۆ جێگیربوونی ئاشتی به بۆچوونی ئەو باس له هەنگاوه پۆزەتیڤەکانی دەکات و قەوارەی دەوڵەتێك به کلیلی ڕاستەقینەی ئاشتی دادەنێت،





بەو پێیەی یەکەم بەردی بناغەی بوونیادی دەوڵەتە و ئەو هەنگاوانەش ئەمانەن:

١- (پێویستە دەستووری مەدەنی هەر دەوڵەتێك دەستوورێکی کۆماری بێت) واتە؛ دەسەڵاتی دەستووری کە بڕیاری شەڕ دەردەکات پێویستە لە ئیرادەی میللەتەوە هەڵقوڵابێت و دەسەڵاتی (تەنفیزی) بە تەواوی لێی جیابێتەوە، ئەم شێوەیەی دەسەڵات باشترین شێوەیە بۆ دەستەبەرکردنی پرەنسیپی سەربەخۆیی و یەکسانی، هەروەها باشترین دەستووریشە بۆ جێگیربوونی ئاشتی، چونکە سیستەمی دەستووری دەوڵەت وادەکات کە ئەوانەی دووچاری ئازار و مەینەتی و خراپەکاری شەڕ دەبنەوە ببنە ئەو کەسانەی، کە داوای بڕیاری ئاگر بەستی شەڕیان لێدەکرێت، لە کاتێکدا دەسەڵاتی ڕەها خۆشی و تاموچێژ لە شەڕ وەردەگرێت و گرنگی نادات بەو هۆکارانەی، کە دەبنە بەڵگە بۆ تاوان بارنەکردنیان لە بەرامبەر دەستەی دبلۆماسی (کە هەردەم بۆ ئەم شتانە لە ئامادەباشیدان).

٢- پێویستە یاسای میللەتان هەڵبستێ بە هاوپەیمانێتی دروستکردن لە نێوان دەوڵەتە سەربەخۆکان.

٣- مافی نیشتەجێبوونی بێگانە، لە ڕووی دەستووری جیهانەوە، کورت دەکرێتەوە، لەوەی ریز لە پلەو پایەی بێگانە بگیرێت، بێ ئەوەی دەوڵەتێك دەست لە کاروباری دەوڵەتێکی تر وەربدات و کەسی تێڕاماو (المتأمل) لەو ماددانە ئەوا بۆی دەردەکەوێت کە (کانت) توانیویەتی



چەندین جار دەست بخاتە سەر شوێنگەی شەڕ و خراپە و هۆکارەکانی شەڕ لێکبداتەوە، بەقەد ئەو زانیارییە مێژووییەی کە هەیەتی، هەروەك خۆشی ئەوەی ڕاگەیاندووە کە ئەو مێژوونووس نییە بۆیە ئەم پرۆژەیە گرنگییەکی تایبەتی هەیە و ئەگەر ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە، کە کانت دانەری چەمکی ئەڵحانی (کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان- عصبة الامم)ە لە دوای مردنی ئەم کەڵە فەیلەسوفە بەنزیکەی سەدە و چارەکێك ئەوا دەرك بەوە دەکەین، کە ئەم فەیلەسووفە بە توانایە چەند کاریگەری لەسەر بیرۆکەی ئاشتی جیهانی هەبووە.

هەندێ لە نووسەران جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە سەرۆك (ویڵسن) بانگەوازکاری دامەزراندنی (کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان) هەمیشە و ڕۆژانە کتێبەکەی (پرۆژەی ئاشتی هەمیشەیی)ی (کانت)ی دەخوێندەوە، ئەمە بەڵگەیە کە لەسەر کاریگەری زۆری ئەم کتێبە لە ئاگادارکردنەوەی مرۆڤ بۆ دامەزراندنی نموونەی ئەم جۆرە دەسەڵاتە باڵایە، کە ویسترا ببێتە بنچینەیەك بۆ هەڵکردنی ئاشتی جیهانی.





## شرۆڤەکردنی کانت بۆ فەلسەفە و مێژوو

سەرەڕای سەرقاڵ بوونی کانت بە ژمارەیەکی زۆر لە زانستەکانی سەردەمی خۆی بە تایبەتیش فەلسەفە، کەچی هەروەك لە قسەکانی (کانت) دەردەکەوێت کەوا گرنگییەکی تایبەتی بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی نەداوە، ئەوەی دەردەکەوێت توێژینەوە پەیوەندی دارەکەیەتی بە سروشتی مرۆڤ و قووڵ بوونەوەیە لە لێکدانەوەی مۆتیڤەکانی ئەقڵ، سەرەڕای توێژینەوەیەکی تەواوی بۆ سروشت، ئەمە پەلکێشی کرد بۆ تێڕامانی مێژووی مرۆڤایەتی بە بۆچوونێکی فەلسەفیانە، لەبەر گرنگی دانی تایبەتی بە نموونەی دیاریکراو لە بیرکردنەوەی میتافیزیقیانە (ئەوەی پەیوەستە بە ئەخلاق) ئەوا فەلسەفە مێژووییەکەی تەواو کامڵ نەبوو و بۆشاییەکی زۆری تێدایە، واتە لە توێژینەوەی بۆ مێژوو بەرەو دروستکردنی فەلسەفە هەنگاوی نەنا، بەڵکو تێڕامانە فەلسەفییەکانی بەرەو هەوڵی جێبەجێکردنی لەسەر مێژوو پەلکێشیکرد، لەبەر ئەوە جێی پەنجەی لەم جۆرە نووسینانە لە چەند وتارێکی پەرت و بڵاوی نێو ڕۆژنامەکان نەبێ زیاتر نەبووە، کە تێیدا دانی بە قورسیی کارەکەیدا دەنێت، هەروەها دانیشی بە دەستەبەر نەکردنی مەعریفەیەکی فراوان سەبارەت بە مێژوو دانا، بەوەی کە وایلێبکات بتوانێت بیرکردنەوە فەلسەفییەکانی بەکاربهێنێت لە لێکدانەوەی هەموو ڕووداو و پەرەسەندنە کۆمەڵایەتییەکان، کە نەژادی مرۆیی پێیدا تێپەڕ بووە.



ڕەنگە گرنگترین بڵاوکراوەکانی (کانت) لەم بوارەدا، وتارەکەی بێت بە ناوی (بیرۆکەیەك سەبارەت بە مێژووی گشتی لە ڕوانگەیەکی جیهانییەوە)، کە لە ساڵی ١٧٨٤ بڵاوی کردووەتەوە، هەروەها توێژینەوەکەی (گریمانە زەینەکان سەبارەت بە سەرەتای مێژووی مرۆڤایەتی ساڵی ١٧٨٦) و پێشبینییەکی تایبەتی لەسەر (کۆتایی جیهان ساڵی ١٧١٩)، بێگومان گرنگترین نووسینەکانی، وەکو وتمان یەکەم وتاری بوو لەسەر مێژوو گشتی سەرەڕای ئەوەی کە لە وتارێکی دووروودرێژ زیاتر نییە.

کانت گرنگی هەبوونی یاسایەکی بۆ مێژووی مرۆڤایەتی تاوتوێ کردووە، ئینجا ئەم یاسایانەی لەسەر شێوەی (٩) تیۆری گشتی و گرنگ داڕشتووە، کە دەتوانین گرنگییەکەی بۆ ئەوە بگەڕێنینەوە، کە لە ڕوانگەی ئەو (کانت)ـەوە ئەتوانین لە ئامانجی فەیلەسووفە تێڕامانخوازەکان بەڕوونی تێبگەین، کە ئەمانە (فەیلەسووفە تێڕامانخوازەکان) ئەیانەوێت لە مێژوودا چیبکەن؟ سروشتی سادە و ساکار و هەستکردنی کانت بە سنوورەکانی مێژوو وایان لێکردووە کە نرخێکی گەورەی لەو بارەیەوە هەبێت. ئەو پێی وایە هیچ کەس ناتوانێت کاری فەلسەفی بکات دوور لە مێژوو، ئەو کارەی کە لە زەینی (کانت) دا هەیە ناکرێت بەبێ بوونی زانیاری تەواو لەسەر ڕووداوە دیاریکراوەکانی مێژوو ئەنجامبدرێت، کاتێکیش کە





ناتوانرێت، کەواتە خۆی ناتوانێت لافی ئەوە لێبدات کە ئەم مەعریفەیە گەیشتووە.

جا کانت تەنها وێنەیەکی ئەو بیرۆکەیەی کێشاوە، هەروەك خۆی باسیدەکات کە ئەم ڕێگای خۆشکردووە بۆ دەستەبەرکردنی کلیلی فەلسەفەی مێژوو، ئەو بۆ کەسانی دوای خۆی جێیهێشتووە، کە ئەم بیرۆکەیە جێبەجێبکەن، لەبەر ئەوە تیۆرەکەی دوورە لەهەر جێبەجێکردنێك یان هەر ئەزموونێك پشتی پێببەستێت، لەلایەکی ترەوە ئەم کارەی کانت بەهایەکی تری هەیە، ئەویش ڕێنمایی کردنە، چونکە لە ڕێگای ئەمەوە گوزارشت لە بنەما ئەقلانییەکانی ئەم جۆرە تێڕامانە دەکات، کە هەڵە قبوولّ ناکات، بۆ نموونە فەلسەفەی مێژوو لای ئەو (کانت) کارێکە بەستراوەتەوە بە فەلسەفەی ئەخلاقگەراییەوە. جا لە ڕاستیدا، تەنها ئاماژە بۆکردنێکیش نییە بۆ ئەوەی، کە کانت بەشێوەیەك لە شێوەکان چارەسەری مێژوو بکات، مەگەر تەنیا پرسیارە ئەخلاقییەکان نەبێت کە ورووژاندنی. هەرچی ئەوەیە کاتێك دەڵێین ئەم پرسیارانە چین؟ ئەوا کانت زۆر بە ڕوونی و زیاتر لە جارێك هەوڵی ڕوونکردنەوەی ئەم پرسیارەی داوە، کانت یەکەمجار هەوڵی داوە حاشا لەوە بکات، کە دژایەتییەك لە نێوان سەربەخۆیی و ئیرادەیی) و (یاسا سروشتییە گشتییەکان) دا هەیە. ئەوەشی ڕوونکردووەتەوە، کە گونجانێك لە نێوان هەردوو بوارەکەدا هەیە، بۆ نموونە لە ڕوانگەی ئەوەوە سروشت وشەیەکە و لە چوار چێوەی (تیۆری مەعریفە)



بەکاردەهێنرێت و مەبەستیشی لەمە ئەو شتانەیە، کە وەکو شێوەیەك بۆمان نمایش دەکرێت و هیچی تر. لە ڕاستیشدا (کانت) شوێن پێی چەمکێکی سەردەمی خۆی کەوتووە لە بارەی گەڕاندنەوەی مێژوو بۆ سروشت، بۆ نموونەش یاساکانی گەردوون وەك یەکێك لە یاساکانی جوگرافیاو کەش و هەوایە، کەوا ((مۆنتسکیۆ)) گوزارشتی لێکردوون، هەروەها وەك یاساکانی ژیانناسی (علم الحياة)، لەگەڵ ئەوەشدا هەنگاوێکی نا لە پێناو ڕزگاربوونی لەم هەڵەیە، بۆ نموونە لە بارەی ئەقڵ لێکۆڵینەوەی کردووە (بەو پێیەی ئەقڵ جەوهەرێکە) خاوەن کیانێکی سەربەخۆ لە دیاردەکان، نەك لەسەر ئەو بنەمایەی، کە یەکێکە لە دیاردە ماددییەکانی گەردوون، بەجۆرێك وا دابنرێت، کە ڕەنگێکە لە ڕەنگەکانی سروشت، هەر بەهۆی ئەمەشەوە توانی گونجانێك لە نێوان هەردوو مەبدەئی ئاشکرایی (یاسا) و هەڵبژرادنی (سەربەخۆیی) دروستبکات، لەسەر بنچینەی ئەوەی کە جەوهەری ئەقڵ، سەربەخۆییە بە پێی ئەو مانایەی، کە خۆی بۆ ئەم وشەیەی داناوە لە نووسینە فەلسەفییەکانی تریدا.

کانت وەڵامی مەسەلەیەکی تر دەداتەوە، کە پەیوەستە بە ئەرکی فەیلەسوف و هەڵوێستی سەبارەت بە واقعی مێژوویی، ئەمەش لە بەشێکی وتارە ناودارەکەیدا هەیە، کە لە پێشتر ئاماژەمان پێکرد و دەڵێت: ((مرۆڤ نازانێت لە کۆتایی گەشتەکەیدا چ بیرۆکەیەکی لەلا دروستدەبێت، سەبارەت بەم ڕەگەزەمان (واتە ڕەگەزی مرۆیی)، کە بە





درێژایی ژیانی، خەسڵەتی خەیاڵی و جیاکراوەی هەبووە، لێرەدا فەیلەسووف هیچی لەبەر دەستدا نییە تەنها مادام ناتوانێت گریمانەیەکی پێشوەختی پێشکەش بکات سەبارەت بە هەبوونی ئامانجێك (ئامانجێکی ئەقڵی تایبەت)، کە خەڵك لە کارەکانیاندا مەبەستیانە- گەڕان نەبێت لە بارەی ئەوەی کە ئایا لە توانایدا هەیە ئامانجێك بۆ سروشت بدۆزێتەوە، هەروەها مەبەستێك بدۆزێتەوە لەو ڕێڕەوە پێچەوانەییەیدا لەگەڵ ئەقڵ. ئەمانە چەند وێنەیەکن لە کاروباری ئادەمیزاد.

ئینجا لە دواییدا (کانت) ئەوە ڕووندەکاتەوە، کە هەوڵدانی جدی بۆ دۆزینەوەی ئەم جۆرە ئامانجە کارێکی پێویستە و ئەگەری دروستبوونی ئاسانە وەك دەڵێت: ((ئێمە حەز دەکەین شتەکان ببینین، چی دەبێت ئەگەر بگەینە ئاستی ونکردنی بەڵگە سەبارەت بەم جۆرە مێژووە (خودی ئامانج)، ئینجا با ئەوە بۆ سروشت بەجێبهێڵین و ئەو مرۆڤە بدۆزنەوە، کە بتوانێت بە گوێرەی ئەم بنەمایە بینەخشێنێت. سروشت مرۆڤێکی هێناوەتە کایەوە، وەکو (کلبەر) کە ڕێڕەوی یان ئاڕاستەی ڕێزپەڕی ئەستێرەکانی خستە ژێر کۆنترۆڵی دەسەڵاتی یاسا جێگیرەکان، بەو جۆرەی کە ئەقڵ بڕی نەدەکرد، هەروەها سروشت ئەوەتا (نیوتن)ی هێنایە کایەوە، کە ئەم یاسایانەی بەگوێرەی هۆکارە سروشتییە گشتییەکان لێکداوەتەوە.



هەر بەم جۆرە (کانت) هەوڵدەدات بۆمانی ڕوونبکاتەوە، کە دەتوانرێت لە مێژوودا هەندێ جار گێرەشێوێنی و دارمان ببینرێت، کە بە گشتی و لەماوەیەکی زەمەنی دووردرێژدا تەنها چەند ئەڵقەیەکە لە زنجیرەی پەرەسەندنی مێژووی مرۆڤایەتی، کە حەتمەن بەرەو پێشدەڕوات.

بێگومان مێژووی مرۆڤایەتی بەرەو باشتر پێشدەکەوێت، ئەگەر ئێمە هەستمان بەوە کردبێت بەهۆی ئەو بارە ڕێژەییە دیاریکراوەی، کە ئێمە هەمانە لە ڕووی کات و شوێن، هەروەها ئەو پەرەسەندنەش یاسای جێگر ئاڕاستەی دەکات، وەك ئەو یاسایەی کە (کیلەر) لە سروشتناسیدا دۆزییەوە.

ئەگەر مرۆڤ پرسیار لە حەتمیەتی هەبوونی ئەم جۆرە یاسایە بکات، ئەو یاسایەی کە مەبەستی بەرەو پێش چوونە، ئەو سەلماندنانەی کە هەن بەس نین، یاخود زۆربەی جار لەلای مرۆڤ ڕوون نین. کانت وەڵام دەداتەوە و دەڵێت: ((پێویستە ئێمە ئەم یاسایانە قبوولّ بکەین، مادام ئێمە هەوڵی دۆزینەوەی کۆمەڵگایەك دەدەین، کە یاسا ئەخلاقییە شاردراوەکانی و ئەقڵە تەواو ئەبستراکتەکانمانی تێدا بلاو بێت، ئەگینا کەسێك ناتوانێت هەستی خۆی دوور بگرێت لە ترس و تووڕەبوون، کاتێك سەرنجی چالاکییەکانی خەڵك دەدات کە لەسەر شانۆی گەورەی جیهاندا نمایش دەکرێت و تێیدا تاکەکان زانایی خۆیان لێرە و لەوێ دەخەنەڕوو، بەڵام پێکهاتەی مێژووی مرۆڤایەتی بەگشتی وا دەردەکەوێت، کە پێکهاتووە لە گەمژەیی و کەمتەرخەمی، زۆر جاریش





له خراپەکاری و بێئەقڵی و دەمارگیری پێکهاتووە. لە ئەنجامی ئەمە و لە کۆتاییشدا سەرمان سوڕدەمێنێت لە زانین و ناسینی ئەوەی، کە ئەو بیرۆکەیە چییە، کە ئێمە دایدەڕێژین لەسەر جۆرەکەمان (مرۆڤ) و شانازی بە خەسڵەتەکانییەوە دەکەین. لەم ڕوانگەیەوە سەڵماندنەکانی کانت کە پێشکەشیان دەکات هەمووی تەواو ئامانجگەراییە، ئەمەش لە (٩) تیۆرەکەیدا بە ڕوون و ئاشکرا لەناو ئەو وتارەی، کە پێشتر ئاماژەی پێکرابوو پێشکەشی کردووە. بۆ نموونە لە تیۆری یەکەمدا، دان بەوە دادەنێت، کە هەموو ئامادە باشییە سروشتییەکانی بوونەوەرێکی دیاریکراو بەجۆرێك ڕێکخراوە، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان لەوانەیە بەشێوەیەکی تەواو و کامڵ دەستەبەر بێت، بە پێی مەبەستێکی خودان ئامانج و سەڵماندنی ئەمەش ئەوەیە، کە ئەگەر چاوپۆشی لەو مەبدەئە بکەین، ئەوا جارێکی تر لە بەرامبەر سروشتێك دانابین، کە لە سەر ئاڕاستەیەکی سیستماتێکی بەڕێوەبچێت، بەڵکو لەبەرامبەر سروشتێکی گاڵتەجار و جێگیردا دەبین، کە هیچ مەبەستێکی لە دواوە نییە. بەم جۆرە ئەقڵ شوێنگەی خۆی جێدەهێڵێت بۆ ئەو ڕێکەوتەی، کە بانگەشە بۆ بێئومێدی دەکات.

لە تیۆری دووەمیشدا (کانت) داکۆکی لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە ئەم بەرەو پێشچوونە بە ڕوونی لەسەر تاکەکان دەرناکەوێت، بەڵکو لەسەر جۆری مرۆڤایەتی بەگشتی دەردەکەوێت.



مرۆڤ بە سروشتی خۆی ئامادە باشی مەبەستداری هەیە بۆ بەکارهێنانی ئەقڵ، ئەگەرچی ئەو ڕیگای غەریزە ناگرێتەبەر، کەچی پێویستی بە هەوڵ و مومارەسەی چاکسازی هەیە بۆ ئەوەی پێ بە پێ بۆ پلەیەکی تر بەرەو پێش سەرکەوێت.

بەم جۆرەش بڕیاری پلەیەکی بەرزتر دەدات بە ئەقڵی ئازاد- پلەیەکی بەرزتر لە غەریزە- لە تیۆری سێهەمدا هاتووە، سروشت (یان چاودێری خوایی) ئەمانە (هەردووکیان دەلالەتی یەك مانایان هەیە لەلای کانت) گەمژانە کارێك ئەنجام نادات لە بەکارهێنانی ئەو ئامرازانەی، کە دەبنە هۆی جێبەجێکردنی مەبەستەکانی و زیادەڕەوی ناکات، چونکە- سروشت- ئەگەر ئەقڵی داوە بە مرۆڤ ئەوا سەربەخۆیی و ئیرادەی تێدا پابەندە، ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر مەبەستی بەڕێوەبردنی، مەبەستم ئەوەیە کە پێویستە ئەمە ملکەچ نەبێت غەریزە یان (ماڵی) بکرێت و کارەکانی لە ڕێگای زانیاری ڕەمەکی ڕێك بخات، بەڵکو پێویستە مرۆڤ هەموو شتێك لە ناخییەوە هەڵبقوڵێت (واتە لە ئیرادەی ئەقڵە سەربەخۆکەیەوە).

لەگەڵ ئەوەی لە تیۆری  چوارەمدا (کانت) دان بە بوونی ئامادەباشی کۆمەڵایەتی لای مرۆڤ نانێت، جەخت لەسەر گرنگیدانی بە ئامادەباشییە نا کۆمەڵایەتییەکان دەکاتەوە، کە وا لە مرۆڤ دەکات ئارەزووی بەرگریکردنی هەبێت بەرامبەر ئەوانیتر، چونکە ئەم بەرگرییە وا دەکات هێز و توانای مرۆڤ هان بدرێن بۆ ئەوەی ڕقیان لە بێکاری





بێت و بۆ ئەوەی مۆتیڤی چاو تێبڕین و حەزی بوون بە خودانی دەسەڵات و شوێنگەیەك لە نێوان تاکەکانی دەوروبەری، ئەو تاکانەی تر کە ڕەنگە سەلیقەیان نەبێت لە گەڵیان بگونجێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێت لێیان جیاببێتەوە.

لێرەوە هەنگاوە راستەقینە یەکەمییەکان دەستپێدەکەن، کە مرۆڤایەتی لە قۆناغی کۆچەری و سادەیی بەرەو شارستانیەت دەبات. جا سوپاس بۆ سروشت بۆ ئەو پارچە پارچە بوونە کۆمەڵایەتی و گەمژەیی و دروستبوونی ئیرەیی و چاو تێبڕین و خاوەنداریەتی دەسەڵاتە، چونکە ئەگەر ئەو نەبوایە ئەوا هەموو ئامادەباشییەکانی مرۆڤ دەمردن و لە پەرەسەندندانەوە بوون.

بەم جۆرە و لەو کاتەدا دەبینین (ئادەم سمث) بانگەشەی ئەوە دەکات، کە کاری تاکەکانی کۆمەڵگا لە کۆی گشتیان و ئامانجی کۆتاییان خزمەتکردنی بەرژەوەندی گشتی گرووپە. کانت ئەم بیرۆکەیەی (سمث) بەشێوەیەکی میتافیزیقییانە لێکدەداتەوە و لە کۆتاییدا دەگاتە ئەو ئەنجامانەی کە (ئادەم سمث) پێیان گەیشتووە.

کانت پەردە لەسەر بۆچوونەکانی سەبارەت بە پێویستی کێبەرکێی بەردەوام لەسەر خاوەندارێتی و دەسەڵات لادەبات، ئەمەش لە پێناو خزمەتکردنی بەرژەوەندی گشتی. لە تیۆری پێنجەمدا ئەوە دەردەخات، کە کێشەی گەورەی جۆری مرۆڤایەتی، کە سروشت ناچاری کردووە (مرۆڤ) چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە گەیشتنە بە دروستکردنی



کۆمەڵگایەکی مەدەنی بۆرژوازی، کە یاسایەکی گشتی فەرمانڕەوایەتی بکات، ئەو کۆمەڵگا بۆرژوازییە ئەوەیە، کە کانت بە جوانترین سیستەمی کۆمەڵایەتی دەیبینێت، چونکە بەشێوەیەك ئەو خۆی بەڵگە بۆ خۆی دەبینێتەوە بۆ چاککردن و پەروەردەکردنی، بەم جۆرەش تۆوی سروشت لە ڕێگای پیشەسازی داهێنەرەوە بە تەواوی پەرە دەستێنێت.

کانت لە تیۆری شەشەم و حەوتەمیشیدا دان بە سەختی و ئەستەمی دۆزینەوەی دەسەڵاتێکی باڵادا دەنێت، کە گونجانێك دروستبکات لە نێوان مەبدەئی کێبەڕکێ و ناکۆمەڵایەتی بوون و لە نێوان پێویستی ملکەچی بوون بۆ یاساکانی و جێبەجێکردنی دادپەروەری پێویست بۆ حەز و ئارەزووە کۆمەڵایەتییەکان.

لەگەڵ ئەمەشدا وەکو سروشتی خۆی گەشبینە سەبارەت بە دروستکردنی ئاشتی هەمیشەیی لە نێوان میللەتان لە ڕێگای دامەزراندنی دەستەیەکی باڵا کە لەسەرووی دەوڵەتانەوە دەبێت و یارمەتی چارەسەرکردنی گێرەشێوێنی یاسایی و بەربەریەت بدات، کە بەرەو یەکگرتنی میللەتان هەنگاو بنێت، بەجۆرێك هەریەکە لەو میللەتە یەکگرتووانە- لە گەورە یان تا دەگاتە بچووکیان ئومێدی تەندروستی خۆی بخوازێت و مافەکانی لە ڕێگای ئەم یەکگرتنە گەورەی نێوانیان و لە رێگای هێزی یەکگرتوو و بڕیاری یاسایی وەربگرێت، کە بە ویستی یەکگرتوویی دەربچێت بۆ هەموو میللەتەکان. بەجۆرێك ئەم گەشبینییەی (کانت)، بەرەو ئەوەی ڕاپێچکرد، کە پێی وابێت ئەو شەڕ





و کوشتارانەی، کە وڵاتانی ئەورووپا دووچاری هاتوون بە هەوڵدانێك دابنێن بۆ گەیشتن بە سیستەمێکی ئایدیالی، بەشێوەیەك کە دەڵێت: ((شەڕ شتێك نییە جگە لە هەوڵی جۆراوجۆر، چەند هەوڵێك لێرەدا ئەگەرچی مەبەستی مرۆڤیش نەبێت، کەچی مەبەستی سروشتە لەپێناو دۆزینەوەی بارودۆخی نویێ بۆ دەوڵەتان و دروستکردنی ڕێکخراوی بە توانا بۆ فەرمانڕەوایيکردن یاخود لانی کەم بۆ هەڵوەشاندنەوەی بارودۆخی کۆن. ئەم حاڵەتە نوێیە یا ئەوەتا ناتوانێت لە چوارچێوەی خودی خۆیدا پارێزگاری لە خۆی بکات یانیش ڕیزبوونەوەی ئەم حاڵەتە هاوشان لەگەڵ یەکتر دەبێتە هۆی ڕوودانی شۆڕشی هاوشێوەی نوێ، ئەم حاڵەتەش بەردەوام دەبێت تا دەگەینە ڕێگای چاکترین سیستەم بۆ دەستووری مەدەنی لە ڕووی ناوەوە، ئینجا دواتر لە ڕێگای ڕێککەوتنی گشتی و پابەندبوونی لەڕووی دەرەوە، حاڵێك کە بەحاڵی بوونەوەرێکی مەدەنی بچێت، بارێك کە بتوانێت پارێزگاری لە خۆی بکات بەو پێیەی کە بۆخۆی بوونەوەرێکە و خۆی جموجۆڵی هەیە- واتە پشت بەخۆی دەبەستێت لە چالاکییەکانیدا-.

لەم ڕوانگەیەوە، پێشبینییەکانی کانت بۆ پێویستی و حەتمیەتی کۆمەڵگای بۆرژوازی و ئەو بارودۆخانەی بەرەو ئەو سیستەمە هەنگاو دەنێت تاڕادەیەکی زۆر بە پێشبینی فەیلەسووفە سۆشیالیستییەکان دەچێت، دەربارەی پێویست بوون و حەتمیەتی کۆمەڵگای سۆشیالیستی، هەروەها دەربارەی ئەو بارودۆخانەی، کە دەرئەنجامێکن





بۆ شەڕو ناکۆکی بەردەوام ئەمەش بەهۆی چەوساندنەوەی هەندێ دەوڵەتی سەرمایەداری بۆ دەوڵەتەکانی تر. هەروەها کانت پێی وایە سیستەمی فیودالیزمی (الاقطاعي) کە تا ئەو کاتیش باوبووە (لە دەوڵەتەکانی سەردەمی ئەودا) خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە بەهۆی سروشتە کۆنەکەیەوە، فەیلەسووفە سۆشیالیستەکانیش پێیان وایە سروشتی کۆمەڵگای بۆرژوازی بۆ خۆی کاردەکات بۆ هەڵوەشان و پارچە پارچەکردنی ئەم کۆمەڵگایە (فیودالیزم)ە. ئەم بۆچوونە داکۆکی لەو ڕاستییە دەکات، کە (کانت) وەك شێوازێك بۆ ئاڵوگۆڕکردنێکی کۆمەڵایەتی ئامانجدار، پێداگیرییەکی بەهێزی لەسەر (جۆرێك لە هاریکاری ئەبیکۆری بۆ هۆکارەکاراکان) داناوە، ئەوە بوو کە لە دواییدا بە (دیالێکتیك)(*) ناسرا.

بەشێوەیەك ئاماژە بەوە کراوە، کە ئەم یاسایە لە توانایدایە وا لە دەوڵەتان بکات، کە هەوڵبدەن ((نموونەی ئەمە وەکو ئەو گەردانەی ماددەن کە بەریەك دەکەون وەك چۆن بۆیان بسازێت، بەشێوەیەك هەموو دامەزراوەکانی دەوڵەت کە بەریەککەوتنە نوێکان دەیان ڕووخێنن، دامەزراوەی نوێیان لێ دروستبکات بتوانێت وەکو خۆی بمێنێتەوە)). ئەو زنجیرە بەریەك کەوتنانە شتێك نین جگە لە شێوە ماددییەکەی دیالێکتیك خۆی نەبێت.

---

**) دیالێکتیك: چەمکێکە (هیگڵ) بەکاریهێناوە، ئەم چەمکەش لە ووشەیەکی یۆنانییەوە، کە (دیالیکۆ)یە، وەرگیراوە.

له تیۆری هەشتەم (کانت) پێداگیریەکەی سەبارەت بە مێژووی جۆری مرۆیی بە گشتی دووپات دەکاتەوە، بەوەی کە بریتییە لە دابینکردنی دەستوورێك بۆ سروشت لە پێناو دۆزینەوەی دەستوورێکی ناوخۆیی کامڵ بۆ دەوڵەت، لە پێناو هەمان مەبەست دامەزراندنی دەستوورێکی دەرەکیش بۆ دەوڵەت بەو پێیەی، کە ئەمە تاکە بارودۆخە کە سروشت بتوانێت تێیدا و بەشێوەیەکی تەواو پەرە بەئامادە باشییەکانی بدات. سەبارەت بە مرۆڤەوە پێویست بەوە ناکات کە بڵێین: ئەمە ئاماژەیەکە بۆ خودی سیستەمی بۆرژوازی. هەرچی تیۆری نۆیەم و کۆتاییە ئەوا تێیدا زەرورەتی هەڵکردنی هەوڵی فەلسەفییانە روون دەکاتەوە بۆ وێنەکێشانی مێژووی گشتی لەسەر بنەمای نەخشە ڕێژکردنی سروشت، کە ئامانجی ئەم هەوڵدانەش تەواو یەکگرتنی مەدەنیانەی جۆری مرۆڤایەتییە. دەڵێین پێویستە وا دابنێین، کە ئەم هەوڵدانە دەکرێت رووبدات، بەڵکو شتێکی بەسوودیشە سەبارەت بەم مەبەستەی سروشت.

له ترسی ئەوەی، کە کەسێك ئەوەی بە بیردابێت، کە (کانت) هەوڵدەدات بەو هزرانەی بەڵگەی پێشوەختی بدۆزێتەوە، ئەم بەڵگانە بە مانایەکی سنووردار لە دۆزینەوەی مێژوو چاوپۆشی بکەن، ئەمەش لەسەر بنەمایەکی ئەزموونگەری وەستاوە. کانت لە کۆتایی وتارەکەیدا دان بەوەدا دەنێت کە هەوڵدانەکەی تەنها بیرۆکەیەکە بۆ ئەوەی



ئەقڵێکی فەلسەفی تر (کە پێویستە لە رووی زانستی مێژووەوە دەوڵەمەند بێت) لە روانگەیەکی ترەوە هەوڵی بۆ بدات.

کانت حاشای ئەوە ناکات، کە زۆربەی سەلماندنەکانی پێشوەختین، واتە لە ئەزموونێکی کردەیی-ماددیەوە وەرنەگیراوە، بیانووشی بۆ ئەمە ئەوەیە، کە سەبارەت بەو سەردەمە تۆماری مێژوویمان زۆر کەمە، ئەوەش بەس نییە بۆ دۆزینەوەی هەر شتێکی گشتی جا ئەو پرۆژەیەی پێشکەشی کردووە ڕێگایەکی کورت و پوخت نییە بۆ دۆزینەوەی رووداوە مێژووییەکان، بەڵکو ئەوە ئامرازێکە بۆ تێبینی کردنی ڕاستییەکان دوای دۆزینەوەیان.

لە کۆتاییشدا دەتوانین ئەم بیرۆکەیەی کانت لە چوار خاڵدا کورت بکەینەوە:

١- بیرۆکەی مێژوو بۆ جیهان نموونەیەکی بەرز و کردەییە، بەڵام ئەمە پێویستی بە کۆکردنەوەی نێوان هەردوو بیرکردنەوە هەیە (مێژوویی و فەلسەفی). پێویستە لە ڕاستییەکان بگەین ئینجا دواتر بیانگێڕینەوە، پێویستە لێکۆڵینەوە سەبارەت بەڕاستییەکان بکەین بە شێوەیەکی بابەتییانە، بەجۆرێك کە بیرکردنەوە نوێنەرایەتی ئەم ڕاستییانە بکات نەك بۆچوونێکی خودی و تەنها بیرکردنەوەیەکی ڕووکەشی.

٢- ئەم مێژووە ئەگەری بوونی پلانێکی پێشوەختی بۆ رووداوەکان دادەنێت، ئەمەش مانای وایە کە پێشکەوتنێکی بەرچاو هەست





پێدەکرێت یاخود شتێکی دی خێراو بە دوای یەك دەیەوێت بێتە ناو بۆشایی واقیعەوە.

٣- ئەو شتەی کە دەیەوێت بێتە ناو بۆشایی واقیعی ماددی، پێگەیشتنی ئەقڵی مرۆییە، واتە ئەقڵ و سەربەخۆیی ئەخلاقی.

٤- ئەو ڕێگایەشی کە کۆتایی دێت بە دەستەبەرکردنی دەسەڵاتی ئەقڵ بەم شێوەیە، سەرکێشی مرۆییە، هەروەها ململانێیە لە سەر دەسەڵات و خاوەندارێتی، بەو پێیەی لە ئامادە باشییە ناکۆمەڵایەتییەکانە و دەبێتە هۆی گەشەسەندنی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان و بەرگری لە تەمبەڵی و ناچالاك بوون دەکات.

ئاشکرایە لە پشت ئەم دەرئەنجامانەی، کە (کانت) پێیان گەیشتووە جۆرێك لە گونجان هەیە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەستە بەو ئەنجامەی کۆتایی، چونکە جەختکردن لەسەر کێبەرکێ و سەرکێشی نا کۆمەڵایەتی -ئەوەی من بیزانم- لەگەڵ ئەو مەبدەئە سەرەکییەی، کە (کانت) فەلسەفە ئەخلاقییەکەی لەسەر بونیادناوە ناگونجێت، ئەو پێی وایە پێویستە لەسەر مرۆڤ کە ئەرکی خۆرسك و سروشتی خۆی جێبەجێ بکات، ئەگەرچی زیانیشی بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی مرۆڤ هەبێت، چونکە ئەرك شتێکی مەزنتر و گەورەترە لە بەهاکانی خێر و خراپەی مرۆڤ کە ئادەمیزاد لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا پێیان شاد دەبێت (دەیانناسێت). هەرچی خاڵەکانی ترە ئەوا لەلایەن چەندین بیرمەند ڕەخنەی لێگیراوە لەوانە (ر.ج.کۆلنجۆد) و (و.هـ.وۆلش) کە ڕەخنەکانیان گشتگیر و پوختن.



## فەلسەفەی (هردەر) و پەیوەندی بەبۆچوونەکانی (کانت)ەوە

مرۆڤ ناتوانێت بە دوای هزرە پەرت و بڵاوەکانی (کانت) دابگەڕێت بەتایبەتیش بۆچوونەکانی سەبارەت بە لێکدانەوەی فەلسەفییانەی مێژوو، تەنها لە ڕێگای خوێندنەوە و تێگەیشتنییەوە دەبێت سەبارەت بە زانینی پەیوەندی نێوان ئەو و بیرمەندانی ئەڵمانی سەردەمی (کانت) و ڕەخنەگران لە فەلسەفەی کانت، ئەو کەسەی کە شتی لێوەرگرتووە، فەیلەسوف و ڕەخنەگر و ڕێنوێنی کەر (هردەر)ـە (١٧٤٤-١٨٠٣). لە ڕاستیشدا ئەم پەیوەندییە فەلسەفییەی نێوان کانت و هردەر لەو پەڕی قووڵی و تێکەڵاویدا بوو، تا وایلێهات ژمارەیەك لە توێژەران ڕای جیاوازیان سەبارەت بە دەستنیشانکردنی قوتابیی بوونی هەر یەکێکیان بۆ ئەویتریان هەبێت.

(هردەر) لە شاری مۆرۆنکن لە پروسیای ڕۆژهەڵات لە دایك و باوکێکی هەژار لە دایك بووە. دوای (٢٠)ساڵ لە لەدایکبوونی کانت. وانەی لاهووت و فەلسەفەی لە کینسبێرگ لە ساڵی (١٧٦٢-١٧٦٤) خوێندووە، بەجۆرێك لەم ماوەیە لە کۆلیژی فردریك، لەم شارەدا، لە زانکۆدا گوێبیستی وانەکانی (ئەمانوئێل کانت) بووە و شتی زۆری لێوەرگرتووە، بەشێوەیەك جوگرافیا و مرۆڤناسی لەلا خۆشەویست کردووە.





له ساڵی ١٧٦٤ بۆ (ریجا) کۆچی کردووه، لەوێدا بووه به مامۆستا له قوتابخانەی (کاتدرائی) و تا ساڵی ١٧٦٩ لەوێدا ماوەتەوه. یەکەم کاری گەورەشی بیری نویٚ بوو له (ئەدەبیاتی نوێی ئەڵمانی) که له ساڵی ١٧٦٧ بڵاوی کردووەتەوه. که ئەمه وایلێکردووه پێگەیەکی بەرز پەیدابکات له نێوان گەوره ڕەخنەگرانی ئەدەب. کاتێك ناکۆکی له نێوان (هردەر) و نووسەرێك بەناوی (کلۆتس) روودەدات، هردەر بڕیاری بەجێهێشتنی (ریجا)ی دا. له ژیانیدا چەند گەشتێکی گرنگی ئەنجامداوه، هەر له سەرەتادا سەردانی (کانت) و پاریس و هامبۆرگی کردووه، لەم شوێنەدا چەندین پیاوی بیرمەندی ناسیوه و کاری یاریدەدەر و مامۆستایی بۆ بیرمەندان کردووه، دوای ئەوەی دەکەوێته داوی خۆشەویستییەکەوه ژن دەهێنێت.

له ساڵی ١٧٧٦ (هردەر) گەیشتووەته (فایمار) لەوێدا (جوته) پێشوازی لێکردووه و چەندین کتێبی گرنگی بڵاوکردووەتەوه و له سەرووی هەمووشیانەوه (فەلسەفەی مێژووی مرۆڤایەتی)یه، که بیروڕا سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکانی تێدا کۆکردووەتەوه، هەروەها کۆمەڵێك نووسینی جۆراوجۆری لاهوتی بڵاوکردووەتەوه و، گفتوگۆی دیالێکتیکی دوور و درێژی وروووژاندووه بەو پێیەی که هزرێك و ڕووداوێکی کتوپڕ و بیرۆکەیەکی چاوەڕوان نەکراوی پیاوێکه که له سەردەمی ڕووناکبیریدایه.



له کۆتاییشدا (هردەر) له (فایمار) ساڵی (١٨٠٣) کۆچی دوایی کردووه، واته بەر له ساڵێك دوای کۆچی (کانت). ئێستاش دوای ئەوەی زۆر بەکورتی له ژیانی ئەو کەڵه پیاوه چەند لایەنێکم خستەڕوو. پێویسته جارێکی تر بیروڕاکانی له فەلسەفه و کۆمەڵناسی بخەمەڕوو. بەتایبەتیش فەلسەفەی مێژوو، بۆ ئەوەی بتوانین له کۆتاییدا سەرنجی چەندێتی کاریگەری ئاڵوگۆڕی نێوان هردەر و مامۆستاکەی (کانت) بدەین. (هردەر) له کتێبه مێژووییه فەلسەفییەکەیدا، که پێشتر ئاماژەمان پێکردبوو و له چوار بەرگ پێکهاتووه، پێیوایه مرۆڤایەتی پەیوەسته بەو پله و پایەیەی که داگیری دەکات له گەردووندا، سروشتی گەردوون له سروشتی بوونەوەرێکی زیندوو دەچێت و به شێوەیەك دروستکراوه، که بتوانێت بوونەوەره باڵاکان دروستبکات (بێنێته سەر شانۆی ژیان) و له ناخیدا پەرەبستێنێت و گەشه بکات. بەم جۆره (هردەر) هەوڵدەدات پەیوەندی نێوان سروشتی مرۆڤایەتی و سیستەمی گەردوون پیشانبدات. بەو پێیەی که ئەگەر بمانەوێت له مێژووی مرۆڤایەتی بگەین، پێویسته سەرەتا شوێنگەی مرۆڤ لەم گەردوونه بزانین و جدیانه تەماشای بابەتەکه بکەین.

(هردەر) پێی وابوو مرۆڤ تایبەتمەندی مرۆیی دیاریکراوی هەیه و لێرەدا کاریگەر بووه بەو ڕاستییه سەپاوەی که دەڵێت: زنجیرەی بەردەوامی پلەبەندی هەیه هەر له سادەترین شێوەی ماددەی نا ئەندامییەوه تا بەرزترین وێنەی که مرۆڤه، به حوکمی ئەوەی له شێوەکانی ژیان،

ئەمیان (مرۆڤ) لە پێکهاتەدا زیاتر ئاژەڵانەیە. ئەم گریمانەیەی بەوە شرۆڤە کرد، کە لێرەدا تاکە هێزێکی ڕێکخراو هەیە لە جیهاندا و لەسەر سەقامگیرکردنی سەربەخۆیی بۆ ڕۆح کاردەکات.

مرۆڤیش باڵاترین بەرهەمی ئەم هێزە تایبەتییەی ژیانە لەسەر ڕووی زەوی، هەموو شتەکانی تر جگە لەمە بۆ خزمەتی ئەو هاتوونەتەکایەوە، بەڵام هەڵەیە گەر گومان ببەین، کە ئەو (مرۆڤ) تاکە دروستکراوێکی ڕۆحییە لە جیهاندا، بەڵکو هەموو شتێك لە نیوەی ڕێگادا لە نێوان دوو جیهاندا دەوەستێت، جیهانی زیندوو، کە پایەی بەرزترە و جیهانی ڕۆحی کە بچووکترین ئەندامە تێیدا. هردەر پێی وایە مرۆڤ بە حوکمی ئەوەی بوونەوەرێکی سروشتییە و بەسەر ڕەگەزە جیاوازەکانی مرۆیی دابەشدەکرێت، هەر ڕەگەزێکیش بە توندی بە ژینگە جوگرافییەکەیەوە بەستراوەتەوە و بەشی خۆی هەیە لە خەسڵەتە ماددی و ئەقڵییەکانی کە ژینگەکەی پێی دەبەخشێت، بەڵام هەر ڕەگەزێکی مرۆیی کاتێك لەسەر شێوەیەکی دیاریکراوی مرۆڤدایە، هەمیشە تایبەتمەندییەکانی بۆ دەستەبەرکراوە و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پشت بە ژینگەکەی نابەستێت، بەڵکو لەسەر بنەمای ئەو تایبەتمەندییانە وەستاوە کە پشتاوپشت لە پێکهاتەیدا بۆی دەگوازرێتەوە. لەبەر ئەوە دەبینین هێز و توانای هەستکردن و خەیاڵکردن لەلای ڕەگەزە مرۆییە جیاجیاکان، لەگەڵ یەکتردا جیاوازە، جیاوازییەکی جەوهەری. هەر ڕەگەزێك بیرۆکەی تایبەت بە خۆی هەیە



سەبارەت بە خۆشبەختی و نموونەی باڵای لە ژیاندا، بەڵام ئەم مرۆڤایەتییە، کە لە ڕووی ڕەگەزەوە لە یەکترجیان، ئەوا دووبارە ئەبێتە لانکێك، یان بنچێك بۆ دروستبوونی بوونەوەرێکی مرۆیی زیندوو لە جۆری بوونەوەرێکی باڵاتر. مەبەستیشمان ڕەگەزی مرۆیی ژیانی جێگیر و نەگۆڕینە، بەڵکو لە چەند قۆناغێکی گەشەسەندندا تێپەڕ دەبێت، هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانی نزیکیَ دەکاتەوە لە کەماڵ، لەسەر ئەم بنەمایە (هردەر) پاڵپشتی لەو بیرۆکەیە دەکات، کە پێی وایە هەر میللەتێك جۆرێك لە هەستکردن و بیرکردنەوە بەسەر تاکەکانیدا دەسەپێنێت کە قابیلی بەشداریکردنی نییە لەگەڵ میللەتێکی تردا، ئەمەیش ئەو بیرۆکەیەیە کە (کانت) سەلماندنە سروشتییەکانی دەسەلمێنێت و (هیگڵ)یش بە ناوی (ڕۆحی میللی) گوزارشتی لێکردووە بۆ ناسینی ڕۆحی ئەڵمانی.

(هردەر) لەناو توێژینەوەی کولتووری نەتەوەیی ئەڵمانیادا نوقوم ببوو، هەر لە سەرەتای بەربەیبوونیەوە و زمان و ژیارە کۆنەکەی و مێژوو و سیستەمەکەی لە سەدەکانی ناوەڕاست و هونەرە میللیی و نەریتەکانی و شوێنەواریان لەسەر کۆمەڵگا. ئامانجیشی دروستکردنی شێوەیەکی نوێبوو بۆ کۆمەڵگای ئەڵمانی کە بەرپرس بێت لە بەرامبەر یەکێتی نەتەوەیی تایبەت بە ئەڵمانیا و پەرەسەندنی.

ئەو دەڵێت: ئایا بەگشتی چاکە دابەش نەبووە بەسەر جیهاندا؟ ئەمەش بۆ ئەوەی ڕەگەزێکی مرۆیی یاخود پارچە زەوییەکی





دیاریکراوی لە جیهان هەموو چاکەکان نەقۆزێتەوە بەڵێ چاکە دابەشکراوە و گۆڕاوە بۆ هەزارەها شێوە و بەسەر هەموو کونجێکی جیهاندا دابەشبووە، هەروەها لە هەموو چەرخ و زەمەنێکدا، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا پلانی نوێ لە ئاسۆدا هەنگاو دەنێت بەرەو پێشکەوتن- ئەمە بە نامە هزرییە باڵاکەم؟!-.

لەڕاستیدا، هردەر کاریگەرییەکی زۆری لەسەر قوتابخانەی ڕۆمانتیکی ئەڵمانی هەبوو بەتایبەتیش لەسەر شڵنگ و هیگڵ. بەجۆرێك ئەو هزرەی کە دەڵێت ژیار لەسەرەخۆ و وردە وردە لە سەرەتایەکی بچووکەوە پەرەی سەندووە، ئەمەیان کرد بە مەبدەئێك، کە هەموو خەڵك بە پیرییەوە چوون. لە ژێر کاریگەری کۆندۆریسە هەڵچووەکانی فەڕەنسا و کلێشەییە- پارێزەرەکان لە ئەڵمانیا، زنجیرەیەکی درێژ لە مێژوونووسان سەریانهەڵدا، گرنگیاندەدا بە بەدواداچوونی یاساکانی پێشکەوتن و گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و قۆناغەکانی.

بەڕاستی (هردەر) نوێنەرایەتی سەردەمێکی دیاریکراوی دەکرد، کە لە هەندێ رووەوە لە سەردەمی کانت جیاوازە، هەروەها جیاوازییەکەش بۆ سروشتی هەریەکەیان دەگەڕێتەوە، بۆ نموونە ڕێژەی هەستیاری (هردەر) زۆرتر بوو (توانا هزری و وشك هەڵاتووەکان) و (خۆشەویستی و سۆز و تێڕامان) لە خوێنیدا دەهات و دەچوو، کەچی کانت پیاوێکی نەرم و نیان بوو، سروشتێکی ڕەخنەگرانەی هۆشیاری هەبوو، لە تێڕامانەکانی بە ئاگابوو و گومانی لە هەموو وێنە غەیبییەکان هەبوو و بە



ڕێژەیەکی کەم بە ڕۆمانتیك کاریگەر بوو، بۆیە جیاوازی هزری نێوانیان شتێکی چاوەڕوانکراو بوو، ئەگەر چی کانت بۆ ماوەیەکی کورت مامۆستای هردەر بوو، هردەر کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر فەلسەفەی کانت، بۆ نموونە کاتێك هردەر بەرگی یەکەمی کتێبە مێژووییە فەلسەفییەکەی، کە لەساڵی ١٧٨٤دا بڵاوکراوەتەوە، کانت زۆر بەخێرایی و بە پەرۆشەوە دەستی بە خوێندنەوەی کرد لەگەڵ ئەوەشدا، کە رەخنەی توندی لێگرت و ساڵی دواتر ئەگەرچی خوێندنەوەی ئەو کتێبە هانی بیرکردنەوەی (کانت)ی دا سەبارەت بەو گرفتانەی کە (هردەر) وروژاندبوونی، ئەمەش هانیدا بۆ نووسینی توێژینەوەی یەکەمی لە فەلسەفەی مێژوو بە ناوی (چەند بیرۆکەیەك) سەبارەت بە مێژووی جیهان لە ڕوانگەیەکی گشتگیرەوە. لێرەوە هەردوو فەلسەفەکە لە ڕووی جەوهەر و ناوەڕۆکەوە لە یەك دەچن بەڵام لق و پۆپەکانیان جیاوازن، جا لەو کاتەی کانت بەلای یاسا ئەخلاقی و بەها پێشوەختییە بە نیمچە میتا فیزیقیەکاندا دەرچوو، هردەر بەلای چاودێری کردنی بەها میللیەکان و بەرز نرخاندنی سیما کەسییەکانی ڕەگەزی ئەڵمانی هەنگاوی دەنا.

بەهەر حاڵ دەتوانین بڵێین، هەردوو فەیلەسووف بە جیاوازی ڕێرەوەکانیان گەیشتوون بە هەمان ئەنجام، کە ئەمە کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لە دروستکردنی ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی ئەڵمانی، ئەم ئایدیۆلۆژیایەش خۆی لە زەرورەتی گرنگیدان بە ئەرکە بنەڕەتییەکان و





بەهێزکردنی ژیان و ویستی تاکی ئەڵمانی و ئامادەکردنی بۆ خزمەتکردنی میللەتی ئەڵمانیدا خۆی دەنوێنێت.

گفتوگۆی سەرنج ڕاکێشەری نێوان ئەم دوو کەڵە پیاوە بوو بە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند بۆ ڕاکانی زۆربەی ڕۆشنبیرانی ئەڵمانی و زۆرێکیش لە ئەوروپییەکان، بەجۆرێك کە هردەر دژایەتی نێوان ئەوەی کە پێشوەختییە و ئەوەیشی ئەزموونگەرییە، مایە پوچ کردەوە، یان لە نێوان شێوە و ناوەڕۆك و هەموو ئەو ئەنجامانەی کانت پێی گەیشتووە، لەوانەش: توانای ئەقڵی مرۆڤ لەسەر بەدەستهێنانی مەعریفە بەهۆی بوونی مەیل، کانت هەستی بەوە کرد بە حوکمی زگماکییەوە مەیل بۆ حەدس دەبێت و هەستی بە مەیلێك نەکرد بەرەو ئەقڵی سەڵمێنراو پەلکێشی بکات، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی هەندێ جار بۆچوونەکانی لەگەڵ میتۆدی زانستی نەگونجێن و پێچەوانەیەتی، ئەگەرچی هەندێجار وا دەردەکەوێت کە زیرەك و بلیمەتە. (هردەر) رەخنەی لە نووسینەکانی (کانت) گرتووە بە ناوی (ڕەخنەی ئەقڵی ئەبستراکت) ساڵی ١٧٩٩ بەوە وەسفی کردووە، کە جۆرە هەڵخەڵەتاندنێکە، ئەگەرچی ئەزموون و تاقیکردنەوەی هەستپێکراوی بۆ تیۆرەکانی لە خۆگرتووە. بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەستە بە (بیرکاری)یەوە. هەرچی ئەوەی کە تایبەتە بە بۆشایی و زەمەن ئەوا (هردەر) بە تەواوی فەرامۆشیکردووە.



لە ساڵی ١٨٠٠ز (هردەر) هێرشی ڕەخنەی بۆ نووسینەکانی (کانت)ی مامۆستای دووپات کردەوە، کە رەخنەی لە بەرهەمی (ڕەخنەی شاژنی حوکم)ی (کانت) گرت، گوایە (کانت) لە جوانناسی (ئیستاتیکا) تێنەگەیشتووە. ئەم ململانێ فەلسەفییە تەنها بە مردنی (هردەر) نەبێت نەوەستا. (هردەر) لە (فایمار) کۆچی دوایی کرد، ئەمەش لە ساڵی ١٨٠٣ تەنها دوای (٣) ساڵ لە بڵاوکردنەوەی ڕەخنەی کۆتایی، واتە ساڵێك بەر لە کۆچی دوایی (کانت).





## کاریگەریی کانت لەسەر فەلسەفەی ئەوروپی

شتێکی ئاساییە کە فەلسەفەیەکی ئاڵۆز و بنەما قووڵی وەکو فەلسەفەی کانت، لە مێژووی هزری مرۆڤایەتیدا ناکرێت بە ئاسانی بەسەر بچێت، بێ ئەوەی پاشماوەی ڕوون و ئاشکرا و پەنجەی دیاری لەسەر پیاوانی بیرمەند بەجێ نەهێشتبێت (فەیلەسووف و ئەدەبناس و زانایانی بواری سروشت و بیرکاری و پەروەردەکاران و زۆری تریش). جا ئەو کەسانەی لەسەردەمی ئەودابوون یاخود لە دوای ئەو لێکۆڵینەوەیان لەسەر نووسینەکانی کردبێت. لە ڕاستیدا ئەو ڕوونکردنەوە گەورە هزرییەی، کە (کانت) دایمەزراند تا ئێستاش هەر ماوە. فەلسەفەی ڕەخنەیی نموونەی ڕووداوێکی گرنگی هەمیشەییە، هەتا ئەگەر وردەکارییەکانی ئەم بنیاد و حوکمە دەرەکییەش بلەرزێت.

بۆ نموونە نووسینەکانی سەبارەت بە بیرکاری لەلایەن (هلبەرت) و قوتابخانەی شێوەکاری لەلایەك و (برۆنەر) و حەدەسخوازەکان) لەلایەکی ترەوە ئەو بۆچوونەی (کانت) یان لە ئامێزگرت، کە دەڵێت: بیرکاری لە گرفت و مەسەلە گەلێکی پێشوەختی پێکهاتووە و وەسفی شوێن و کات و ئەو بنیادانە دەکات کە تێیدایە. (هلبەرت) شتێکی بۆ ئەم بۆچوونە زیاد کرد بۆ ئەوەی سیفەتی بێکۆتایی کردەیی بە بیرۆکەی کانتیزم ببەخشێت.



ڕێبازی هزری، کە هەریەك لە (فیختە، شللگ، هیگڵ و شۆبنهۆر) جەختیان لەسەر ئایدیالیزمی کانت دەکردەوە، بەشێوەیەکی سەرەکی و بە جۆرێك کە ڕەخنەی کانت بۆ ئەقڵ و ستایشکردنی هەست، ڕێگای بۆ ڕێبازی (ئیرادە)ی شۆبنهۆر و نیچە و، بۆ ڕێبازی (چێژ)ی برگسۆن خۆشکرد، هەروەها ڕێبازی پاساوگەرایی (الذرائع)ی ولیەم جیمس، هەروەها جیاوازی کردنە بەناوبانگەکەی (کانت) کە لە نێوان ئەقڵی ئەبستراکت و ئەقڵی زانستیدا کردبووی، خزمەتی زۆرێك لە فەیلەسوفانی ئەخلاقی لە قوتابخانە جیاجیاکان کردووە. دەکرێت بوترێ کە سەلماندنەکانی کانت سەبارەت بەو (دژ یەکیانەی) کە شێوەی وا وەردەگرێت، جیاواز بێت لە واقیعە بابەتییەکەی سەرچاوەیەك لە سەرچاوەکانی تیۆری هیگل، کە دەڵێت: واقیع پێچەوانەی خود خودەکەیەتی، دژیەکییەکان (المناقضات) ئاستی بەرز دەبێتەوە بە دووپات کردنەوەی پێکهاتەی (وێنەکە) کە پێکهاتەیەکی دیالێکتیکییە.

هەرچی ئەوەی تایبەتە بە فەلسەفەی (مەعریفە)ی کانت، کە تێیدا دەڵێت: جیهانێکی پڕ لە راستی ڕێژەیی هەیە، کە گۆڕانی بەسەردا دێت بە گۆڕانی زەمەن و شوێن. ئەمەش شوێنکەوتوانی ڕێبازی دژە دیاردەگەرایی پارێزگاری لێدەکەن و فەیلەسووفی (بیرکاری) (ئەنیشتاین) یش بەشێوەیەکی جەوهەری وەریگرتووە و تیۆرە





بەناوبانگەکەی بە ناوی (ڕێژەییبوون) لەوەوە وەرگرتووە و لە دواییشدا بوو بە سەرچاوەیەکی نوێ بۆ فەلسەفە پەرە سەندووەکانی تر.

سەرەڕای ئەوانەی سەرەوە، فەلسەفەی کانتیزم بە تایبەتیش (ڕەخنەی شاژنی حوکم) کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر پەیدابوونی فەلسەفەی (ئایدیالیزمی) لە ئەڵمانیا هەبوو بە تایبەتیش لەلای (نیچە) و شوێنکەوتوانی، ئەوانەی ڕایان لەگەڵ کانتدا جیاواز بوو سەبارەت بەوەی کە ئەمان وەها تەماشای خود دەکەن بەوەی نەك تەنها دەرك بە جیهان دەکات، بەڵکو بە شێوەیەك لە شێوەکان (جیهان) دروستدەکات.

بەڵام سەبارەت بە فەلسەفەی مێژوو لەلای کانت، ئەوا ڕێبازەکەی کاریگەری لەسەر ژمارەیەك لە بیرمەندانی سەردەمی خۆی و ئەوانی دوای خۆیشی هەبووە. بەشێوەیەکی تایبەتیش لەلای هیگڵ دەنگی دواتەوە، هەروەها کاریگەرییەکی گرنگی لەسەر بۆچوونەکانی فەلسەفەی ئەڵمانی کە (هردەر) ئاڵاکەی هەڵگرتبوو هەبوو وەکو چۆن پێشتر باسمان کرد.

**- کۆتایی -**





